# ترس و ڕق

## لە نێوان ئەمەریکا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا

گۆران سەباح غەفور

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە:

سەبور سۆران

MUKIRYANI
ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION

هەولێر - ٢٠١٢

**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **ترس و رق لە نێوان ئەمەریکاو رۆژهەڵاتی ناوەراستدا**
- نووسینی: گۆران سەباح غەفور
- وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: سەبور سۆران
- نەخشەسازی ناوەوە:جێگرعەبدولجەبار
- بەرگ: جێگرعەبدولجەبار
- ژمارەی سپاردن: (٢٢٨) ساڵی (٢٠١٢)
- نرخ: ٢٠٠٠
- چاپی یەکەم: ٢٠١٢
- تیراژ: ٥٠٠
- چاپخانە: موکریانی(هەولێر)

زنجیرەی کتێب (٦٧٣)



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست

بۆ

هاوڵاتییانی ئەمریکی

گەلانی رۆهەڵاتی ناوەڕاست

فولبڕایتەرانی رابردوو، ئیستەو ئاینده

---

دەروازە

له دۆزەخەوە بۆ بەهەشت، له بەهەشتەوە بۆ دۆزەخ. له کورستانی ٥ ملیۆن کەسی بۆ ئەمەریکای ٣١٠ ملیۆن کەسی. له وڵاتێکی وێران بۆ وڵاتێکی سیستماتیك. له جیهانی سێیەمەوە بۆ جیهانێکی فره پێشکەوتوو. له وشکانی بۆ ناو زەریا، له بیابانەوە بۆ مێرگ و چیمەن. له کەشوهەوای خۆڵاوییەوە بۆ شنەبای فێنك و بای بێگەرد. له کۆمەڵگەیەکی چەوسێنراو، عەشایری دواکەوتوو بۆ کۆمەڵگەیەکی سەربەخۆ، تاکگەرایی پێشکەوتوو. هەم گۆران له وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

ئەم کتێبە بەری یەك ساڵ رۆندك رشتن، تێڕامان، بیرکردنەوە، فێربوون، نامۆیی، هەناسەدان له نۆستالژیا و خۆشی و ناخۆشییە. بەری هەستی غەریبی ماڵ و منداڵ و دووره وڵاتی و بەراوردی نێوان بەهەشت و دۆزەخە.

## ١

# هەست بە تاوان مەکەن

گەلانی رۆهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتی و زۆرینەی گەلی عێراق بەتایبەتی تا سەر ئێسقان رقیان لە سوپای ئەمەریکا و حکوومەتی ئەمەریکا و ئەمەریکاییەکان دەبێتەوە. ئەم رقە لە جەنگی عێراقدا زیادی کرد. ئەم رقە سەرچاوەی گرتووە لە سیاسەتی چەوتی ئەمەریکا لە رۆهەڵاتی ناوەڕاست و فیلمەکانی هۆلیوود کە بۆچوونی چەوتیان لای رۆژهەڵاتییەکان دروست کردووە لەبارەی ئەمەریکاییەکان.

خەڵکی ئەمەریکایی لە گەلانی رۆهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتی و گەلی عێراق بەتایبەتی دەترسن و لێیان نیگەرانن. بۆچوونیان لەسەر خەڵکی رۆهەڵاتی ناوەڕاست بەعێراقیشەوە بەم شێوەیە: هەرکە گوێیان لە رۆهەڵاتی ناوەڕاست دەبێ، یان بەخەیاڵیان دادێ، یەکسەر وا هەست دەکەن دەیانکوژن. ئەم ترسە سەرچاوەی گرتووە لە تیرۆریزم. ترسەکە هەڵکشا دوای هێرشەیلی یازدەی سێپتێمبەری ٢٠٠١ کاتێ قاعیدە بەرپرسیارەتیی راگەیاند.

گەلی ئەمەریکایی و گەلانی رۆهەڵاتی ناوەڕاست بەعێراقیشەوە خەتابار نین و لە بنەڕەتدا نە لە یەکتر دەترسن و نە رقیان لەیەکتر دەبێتەوە. ئەمە لەبەرئەوەی هەر هەموویان مرۆڤن. جیاوازن لە یەکتر؟ بەڵێ. بەڵام رقیان لە یەکتر نابێتەوە و لە یەکتری ناترسن. رق و ترس لە نێوان هەردوو ناوچەدا دروست بووە بەهۆی میدیا. میدیا هەردەم رووی ناشیرینی کەمینەیەکی زۆر بچووکی رۆهەڵاتی ناوەڕاست پیشان دەدا. میدیا هەردەم رووی ناشیرینی ئەمەریکا و ئەمەریکاییەکان پیشان دەدا. راستە

تیرۆریزم لە هەناوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دروست بوو، ڕاستە سیاسەتی ئەمەریکاش لەو دەڤەرە هەڵەیە، بەڵام هەردوو لا کەمینەن. میدیا ئەو شتانە گەورە دەکاتەوە.

★★★

لە ئەمەریکا خۆم بەهەر ئەمەریکاییەك دەناساند و دەمگوت خەڵکی کوردستانی عێراقم، دەسبەجێ هەستی بەتاوان و ترس دەکرد. وای دەزانی ئەو هۆکاری وێرانکردنی عێراقە. هەستی دەکرد بەبڕیاری ئەو ڕۆژانە لە سەت هاوڵاتی زیاتر گیانیان لە دەست دەدا. هەبوو نەیدەزانی کوردستان چییە، بۆیە ناچار هەموو خۆناساندنێك عێراقێکم پێوە دەلکاند. منیش بەوە هەستم بەکەمی و شەرمەزاری دەکرد چونکە کەس نەیدەزانی کورد چییە وێڕای ئەو هەموو دەردەسەرییەی لە تەواوی مێژوودا بینیویەتی. کەواتە سیناریۆی هەر خۆناساندنێك دەردێکی دڕدۆنگ بوو هەم بۆ من هەم بۆ ئەمەریکاییەکان.

من کارلۆسم، ئەی تۆ؟

+ من گۆران.

= خەڵکی کوێی؟

+ کوردستان

= کوێ؟

+ کوردستان

ئەها قەت گوێم لێ نەبووە، لە کام بەشی دنیایە.

+ بەڵێ ، کوردستان هەرێمێکی ئۆتۆنۆمیی فیدرالی سەر بەعێراقە. ئێمەی کورد لە باکوری عێراقدا دەژین.

کە باسی عێراقم کرد، یەکسەر بەدەیان زمان لە نێوچەوانی نووسرا "داوای لێبوردن دەکەم بۆ ئەو نەهامەتی و دەردەسەرییەی بەسەر عێراقماندا هێنا."

یەکسەر بەم شێوەیە کەوتمە گۆ بۆ ئەوەی چی تر هەست بەتاوان نەکات:

"هەست بەتاوان مەکە. ئێمە لە کوردستان خۆشحاڵ بووین بە شەڕەکە، چونکە ئەمەریکا دیکتاتۆرێکی گەورەی لە ناو برد کە سێ دەیە زیاتر دەستی سوور بووبوو بەخوێنی گەلی کورد. ئێمە پشتگیریی شەڕ و کارنامەی ئەمەریکامان کرد، بگرە هاوکاریشمان کردن لە مەیدانی شەڕدا."

هەرکە ئەم قسانەی بیست، کارلۆس دەموچاوی گەش بووەوە. بۆ یەکەم جار هەستی کرد وڵاتەکەی کارێکی باشی کردووە. میدیای ئەو وڵاتە هەرگیز وردەکاریی شەڕی دانەپۆشی، تەنیا دڕشتی. دڕشتی شەڕ بریێتی بوو لە تەقینەوە، کوشتن، بڕین، وێرانکردن و خوێن ڕشتن و نەوت. میدیای گشتی جارجارە بروسکەئاسا ئاماژکەیەکی بەلایەنە جوانەکانی شەڕ دەدا! ڕاستە هەردەم شەڕ مایەی شەرمەزارییە، بەڵام ڕەوشی عێراق بەر لە شەڕ باشتر نەبوو لە دوای شەڕ. گەلێك ستەمدیدە پێویستی بەفریادڕەسێك بوو ڕزگاری کا لە دەستی خوێنمژ و ملۆزمێکی زوحاکئاسا.

ئیتر کارلۆس دەستی گوشیم و گوتی "خۆشحاڵم." من زیاتر.

کە ڕۆیشت دنیایەك سوپاسی لێ باری و خۆشحاڵ بوو بەوەی یەکێکی بینی ستایشی شەڕی کرد.

لەو خۆناساندنانەدا ئەوەم بەدی دەکرد کە ئەمەریکایی پڕن لە سۆز و میهرەبانی . بەپێچەوانەی هەموو ئەو بۆچوونانەی کە لە دنیای ڕۆهەڵاتی ناوەڕاستدا هەن لەبارەی ئەمەریکا. گەلانی وڵاتانی ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست حوکمی خەڵکی سادەی ئەمەریکایی دەکەن لەسەر بنچینەی سیاسەتی دەرەوەی حکوومەتی ئەمەریکی کە لەلایەن چەند بازرگانێکی زەبەلاح دێتە بەڕێوەبردن.

★★★

من جولیم، تۆ؟
گۆران.
خەڵکی کوێی؟
کوردستانی عێراق.

دەموچاوی نیشانەی نەبیستنی دا. منیش تێم هەڵدایە و گوتم:

گەلی کورد لە باکوری عێراقدا دەژی. حکوومەت و پەرلەمان و دەستووری خۆی هەیە، بەڵام بەشێکە لە عێراق.

جولیش هەستی بەتاوان کرد. وای زانی ئەو بووەتە هۆی بێوەژنبوونی چوار ملیۆن ئافرەتی عێراقی. هەستی کرد ئەو لەپشتی هەموو ئەو منداڵە چاوگەشانەیە کە ئێستە بێ سۆزی باوك یان دایك دەگوزەرێن. لە چاوی ئەوە دەخوێنرایەوە کە شایەنی لەداردانە.

هەرکە هەستم بەوە کرد، دەستم کرد بە دلّدانەوەی:

گەلی کورد لە عێراق رقی لە ئێوە نابێتەوە، چونکە ئێوە لە دەستی دێوەزمەیەك رزگارتان کرد. دەگوترێ کەس لە شەڕ براوە نییە، بەڵام لەم شەڕەدا ئێمەی کورد بردمانەوە. عێراق و ئەمەریکا دۆڕاندیان، ئێمە بەریمان خوارد. ئێمە هیچمان نەبوو بیدۆڕێنین، بۆیە بردمانەوە.

جولی بزەیەکی کرد و گوتی "خۆشحاڵ بووم بەناسینت، ئەوە ژمارەکەمە تەلەفۆنم بۆ بکە کاتێکی تر دەچین قاوەیەك پێکەوە دەخۆینەوە."

★★★

لە ئاهەنگی سپی و رەش داوەت کرام. یەکەم جارم بوو و نەمدەزانی ئاهەنگی رەش و سپی یانی چی. وامزانی ئاهەنگەکە تەنیا بۆ سپی و رەش پێستانە، چونکە پرسی رەگەزپەرستی لە ئەمەریکا پرسێکی قووڵ و ئاڵۆز و گەورەیە. هەرکە گەیشتمە ناو ئۆتۆمبیلی تۆماس، هاوڕێ ئەمەریکاییەکەم، گوتم:

تۆماس من زەیتوونی پێستم، ئاساییە لە ناو رەش و سپییاندا بم؟

تۆماس زۆر پێکەنی و گوتی: گۆران رەش و سپی واتە ئاهەنگێك تەنیا بەجلی رەش و سپی نەك رەش و سپی پێست.

لە گەرمەی ئاهەنگەکەدا بووین، باریکە بەژنێك لێم نزیك بووەوە و گوتی:

چۆنی؟ من لارینم.

سوپاس من گۆران.

خەڵکی کوێی؟

کوردستان... دەکەوێــتە باکوری عێراق. پێی دەگوترێ کوردستانی باشوور چونکە سێ پارچەی تری کوردستان هەیە کە دەکەونە تورکیا، سوریا و ئێران.

بە تەمابووم تەواوی مێژووی دابەشبوونی کوردستانی بۆ باس بکەم، بەڵام ئێمە لە ئاهەنگدا بووین. لە سەروسیمایڕا دیار بوو تاقەتی سیاسەت و شتی وای نییە. بۆیە یەکسەر تێیگەیشتم و بابەتەکەم گۆڕی.

گەلی کورد گەورەترین نەتەوەی بێ دەوڵەتی دنیایە، من وەك کوردێك حەز دەکەم شەو و ڕۆژ باسی کورد بۆ ئەمەریکاییەکان بکەم، چونکە کەس نامانناسێت و کەس لە واقیعی ئێمە تێناگات. مەبەست لە کەس کەسانی ئاساییە. سیاسەتوان و دیپلۆماتکار تا رادەیەك شارەزای پرسی کوردن لەبەر ئەوەی نا کە کوردیان خۆش دەوێ بگرە لەبەرئەوەی چەندان جار بەڵێنیان بە کورد داوە و نایەنبردووەتە سەر.

دواتر سەرمەست و دڵتەنگ بەخۆی و گلاسە شەڕابەکەی هاتەوە لام و گوتی "گوتت خەڵکی عێراقم، وانییە؟"

بەڵێ . . . کوردستانی عێراق، بەڵێ.

+ داوای لێبوردن دەکەم بۆ ئەو هەموو ناخۆشییانەی ئەوێ کە دوای شەڕی ٢٠٠٣ روویان دا.

جاری یەکەم کە باسی نەکرد، دڵخۆش بووم کە هەست بە تاوان ناکات یان ئەوەتا ئاهەنگە و نایەوێ هەستی پێ بکات. بەڵام کە وای گوت یەکسەر دەستم کرد بە ساناکردنەوەی بابەتەکە و گوتم پێویست بەلێبوردن ناکات، چونکە ئێوە کارێکی مەزنتان بۆ بەرژەوەندیی کورد کرد.

کە ئەمەی بیست چاوی ئەبڵەق وەستا و وایزانی من سەرخۆشم.

دواتر بۆم روون کردەوە بۆ ئەم قسەیە دەکەم.

گوتم: سەدام حوسێن و دارودەستەکەی کەوتبوونە وێزەی گیانی کوردان، ئەم شەڕە بۆ ئێمە خێری تێدا بوو، چونکە سەدام حوسێن بە ئەمەریکا نەبا قەت لانەدەچوو.

+ ئەی باشە ئەو هەموو تەقینەوەیە چییە لە دژی هێزەکانی ئەمەریکا لە عێراق؟

تەقینەوە لە کوردستان نییە. تا ئێستە یەك سەربازی ئەمەریکی لە کوردستان نەهاتووەتە رفاندن یان کوشتن. کوردستان خۆی بەنزیکترین هاوپەیمانی ئەمەریکا دەزانێت لە عێراق و رۆهەڵاتی ناوەڕاست. تەقینەوەکان لە ناوەڕاست و باشوورن. نەمویست بچمە ناو ووردەکاریی تەقینەوەکان کە لە دژی هێزەکانی هاوپەیمانان و گەلی عێراقی و وڵاتی عێراق لەلایەن وڵاتانی دراوسێ و سەرەخۆرەکانی ناوەخۆ و قووڵتری بکەمەوە.

★★★

رۆژێك لە مایامی لە بەردەم دەریا، بیرم لەوە دەکردەوە بۆچی خەڵکی ئەمەریکایی هەست بە تاوان دەکەن. خۆم وەڵامی خۆم دایەوە کەوا خەڵکی ئاسایی خاوەن سۆز و هەستە. چۆن شەڕی بۆ خۆی ناوێ ئاواش بۆ گەلێکی تری ناوێت. گەلی ئەمەریکایی لە باشی خۆیان هەست بە تاوان دەکەن. ئەم هەستکردنە دەیسەلمێنێت کەوا ئەوان لە دژی شەڕن، ئەوان نین بەهەڵە لە دنیای رۆهەڵاتی ناوەڕاست گەیشتوون. ئەوە میدیای ئەوانە وێنەکە خراپ دەگەیەنێت. ئەوە سیاسەتی دەرەوەی ئەوانە هەڵە مامەڵە دەکات و هەڵەی گەورە دەکات. خەڵکی ئەمەریکی دڵیان باشە. مەبەستم لە خەڵکی ئەمەریکایی، خەڵکی سادەیە نەك سیاسەتوان و بازرگانان.

دەنگێکی ناسك لە پشتەوە گوتی: چۆنی؟ من لیلیم.

رووم وەرسوڕاند و گوتم: تۆ چۆنی، گۆرانم.

خەڵکی کوێیی؟

کوردستان

کوێ

کوردستانی عێراق کە لە ١٩٩١ەوە هەرێمێکە خۆی خۆی بەڕێوە دەبات.

چی تۆی هێناوەتە ئێرە؟

## ٢

# (فوڵبرایت منی هێناوەتە ئێرە)

هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا. تەماشای شەپۆڵگەلێکی دەریام کرد کە تا نێزێیکی من و لیلی بەغار هاتن و دواتر گەڕانەوە. تەغارێك لمیان لەگەڵ خۆیان هێنا و تەغارێکیشیان راماڵی. قوومێکم لە بیرەکەی پێشە خۆمدا کە لە ناو قۆرتێك بەلم دەورم دا بوو بۆ ئەوەی گەرم نەبێت. بیرەیەکم دەرهێنا لەو پۆلە بیرەیەی لە لە نێو لمدا نغرۆم کردبوون. قەپاخی بیرەکەم بەددان هەڵپچڕی و دام بە لیلی. بەخۆشحاڵییەوە وەری گرت و بیرەکانمان پێك دادا و گوتم: بۆ فولبرایت!

لیلی دای لە قاقای پێکەنین و گوتی "چت گوت، فولّ..."؟

تەماشای ناوەڕاستی دەریام و کرد و گوتم: ئا فوڵبرایت. قەت بیستووتە، هیچ لەبارەیەوە دەزانی؟

سەری نەریی لەقاند و دوای قوومێك بیرە گوتی "قەت گوێم لێ نەبووە، پێم بڵێ باسی چی دەکەیت؟"

قوومێکم لە بیرە ساردەکە دا و گوتم: من فوڵبرایتەرم و فوڵبرایت منی هێناوەتە ئێرە.

بەدوو پەنجە زوڵفی درێژی لای راستی خستەوە بن گوێ و گوتی: دەتەوێ پێم بڵێی تۆ مرۆڤێکی گرینگی. ئەمەی گوت و زەردەخەنەیەکی هاتێ.

بیرەکەم تا بەردەمم برد. ئەمجارە بەبێ هۆ قوومم لێ نەدا و گوتم: نامەوێ سەرت بێشینم و بەلای پرسە ئەکادیمییەکانەوە بچم. ئێمە هەردووکمان لە پشووین. بەس ئەگەر حەز دەکەی دەتوانم باسی فولبرایتت بۆ بکەم.

لە تەماشاکردنی دەریا بووەوە و نیگای کردم. بەو نیگایە ویستی پێم بڵێ بۆ هەستم بریندار دەکەیت. قوومێکی درێژی لە بیرەکەی دا و گوتی: نا بەپێچەوانەوە.

حەز دەکەم بزانم فولبرایت چییە، ئێمە شەو و رۆژ هەڵیت و پەڵیت لە دەممان دێتە دەرێ، دەبا هەندێ باسی شتگەلێکی ماقوول بکەین.

لە پاڵکەوتنەوە هەستامەوە و دانیشتم. قوومێکم لە بیرەکەمدا و گوتم باشە باسی فولبرایتت بۆ دەکەم، بەڵام هەر کاتێك بێزار بووی پێم بڵێ بۆ ئەوەی بابەتەکە وەرگێڕین. بە ئاستەم سەری ئەریێ لەقاند. لە دەموچاوی خوێندمەوە کەوا هەست دەکات دەبێ باسکردنی فولبرایت ئەوەندە ناخۆش بێت ئەو کابرایە ئاوا بەهەستیارییەوە پێم دەڵێ.

ئیتر بەم شێوەیە باسی فولبرایتم بۆ لیلی کرد کە ئەوکاتە پاڵی دابووەوە و قووڵ لە ئاسمانی دەڕوانی و منیش بەدەم تەماشاکردنی شەپۆڵەکانەوە کە ئەم جارە تا بن پێمان دەهات دەستم پێ کرد:

فولبرایت بەرنامەیەکە هەلی زەماڵە بۆ کەسانی بلیمەت و زیرەك دەڕەخسێنێت بێن لە ئەمەریکا ماستەر بخوێنن. بەرنامەیەکی دوو سەرەیە. واتە هەم قوتابی لە تەواوی دنیا دێنێتە ئەمەریکا و هەم لە ئەمەریکاش دەباتە وڵاتانی تر.

فولبرایت لە پێنج بەش پێك هاتووە: بەرنامەی فولبرایت بۆ قوتابیانی ئەمەریکا، بەرنامەی فولبرایت بۆ قوتابیانی بیانی واتە دەرەوەی ئەمەریکا، بەرنامەی فولبرایت بۆ سکۆلەری ئەمەریکی، بەرنامەی فولبرایت بۆ سکۆلەری بێگانە و بەرنامەی فولبرایت بۆ مامۆستایانی بیانی زمانی ئینگلیزی.

لە کاتێکدا من گەرم بووبووم لەگەڵ باسکردنی فولبرایت و هەوڵم دەدا بە ڕێکوپێکی باسی بکەم و سەر لە لیلی نەشێوێنم، لەپڕ دەنگی هەڵێنا و پرسی: تۆ لە کام بەرنامەی؟

بەم پرسیارە بیرکردنەوە و قسەمی پچڕی. ئەم پرسیارکردنەی زۆر لە رەفتاری رۆژنامەنووسان دەچوو کاتێ لە قسەی بەرامبەر پرسیار دروست دەکەن. تەماشایەکم کرد و گوتم: ئا... من لە بەرنامەی دووەمم واتە بەرنامەی فولبرایت بۆ قوتابیانی بیانی. من لە کوردستانی عێراق وەرگیراوم. ئەم بەرنامەیە لە ساڵی ٢٠٠٤ەوە

هاتووەتە عێراق. سەرەتا ژمارەیەکی کەمیان وەردەگرت. دواتر بوو بە سی و پێنج کەس. بەڵام لە ٢٠٠٩، بەبڕیاری حکوومەتی عێراق و ئەمەریکا بوو بە حەفتا کەس.

"واو!" لیلی سەری سوڕما.

دواتر بەردەوام بووم لەسەر باسکردنی فولبڕایت. گوتم: بەرنامەی یەکەم تەنیا بۆ قوتابیان و دەرچووان و هونەرمەندانی ئەمەریکایە، کە دەتوانن تەقدیم بکەن و ساڵێك لە وڵاتانی دەرەوە بخوێنن. بەرنامەی دووەم قوتابیان و دەرچووانی وڵاتانی دەرەوەیە کە دەتوانن تەقدیم بکەن و ماوەی دوو ساڵ لە ئەمەریکا ماستەر لەو بوارەی هەڵیدەبژێرن بخوێنن. بەرنامەی سێیەم سکۆلەری ئەمەریکی رەوانەی دەرەوە دەکرێت بۆ ماوەی ساڵێك یان زیاتر بۆ لێکۆڵینەوە. بەرنامەی چوارەم سکۆلەری دەرەوەی ئەمەریکا دەهێنرێتە ئەمەریکا تا بۆ ماوەی ساڵێك یان زیاتر توێژینەوە بکەن. بەرنامەی پێنجەم بۆ مامۆستایانی ئینگلیزییە لە دەرەوەی ئەمەریکا. ئەوانەی لەو بەرنامەیە وەردەگیرێن دێنە ئەمەریکا تا توانستی گوتنەوەی زمانی ئینگلیزیان باش بکەن و فێرە کولتووری ئەمەریکی بن.

زانیم ئێستە لیلی ئەوەی بە مێشکدا هاتووە کە ئەوانەی وەردەگیرێن پارە دەدەن یان لەسەر کێ دێن بۆ ئەمەریکا یان دەچن بۆ وڵاتانی دەرەوەی ئەمەریکا. بۆیە هەر زوو گوتم: بەرنامەی فولبڕایت کۆمەکی داراییی لە نووسینگەی کاروباری کولتووری و پەروەردەیی سەر بە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا وەردەگرێت. بەڵام ئەو نووسینگەیە بەشێکی پارەکە دەدات و بەشەکەی تریش دەکەوێتە سەر ئەو وڵاتەی قوتابییەکە لێیەوە دێت، واتە حکوومەتی ئەو وڵاتە دەیدات. بۆ نموونە لە کەیسی من حکوومەتی عێراقی و ئەو نووسینگەیە مەسرەفی تەواوی من دەکێشن تا تەواو دەبم.

لیلی لەپڕ پرسی: ئەی تەقدیمات چۆنە؟ هەموو کەس بۆی هەیە تەقدیم بکات.

کەمێك لە دەریا رامام و ئەوجا گوتم: بەڵێ هەموو کەس بۆی هەیە تەقدیم بکات، بەڵام تەنیا ئەو کەسانە وەردەگیرین کە ئاستێکی بەرزی پەروەردەییان هەیە و بلیمەتن. ئەمەش واتە پێشبڕکێکە زۆر گەرمە و چونکە بۆ نموونە لە عێراق بەدەیان

هەزار کەس تەقدیم دەکەن بۆ حەفتا کورسی. کەواتە ئەوانەی لە فولبڕایت وەردەگیرێن بەڕاستی جیاوازن و هەردەم لە وڵاتی خۆیان لە لووتکەدان.

لیلی بەنگێکی نیوەبەرز گوتی: هووووو یاهووووو، من ئێستە لەگەڵ بلیمەترین گەنجی عێراق قسە دەکەم."

خەنیمەوە و گوتم: ئەی چۆن، تۆ بەختت هەیە من قسەت بۆ دەکەم.

ئیتر هەردووکمان پێکەنین. دواتر گوتی: بەڕاستی ئەمە مایەی سەرنجە. کارێکی زۆر باشە، هەرگیز نەمزانیوە کە بەرنامەیەکی وا لە ئەمەریکا هەیە.

دوا قوومم لە بیرەکە دا، کە هێشتا هەر سارد بوو. لیلیش قوومێکی تری هەڵدا کە ئەویش دوا قوومی بوو. بیرەمان تەواو کرد. دوو بیرەی ترم لە بن لم دەرهێنا و هەردووکیانم بە ددان شکاند. لیلی پێکەنی و گوتی ئەمە خراپە. منیش گوتم نا ئەوە ڕێگەی کوردییە، لە حاڵەتێك کە هیچمان پێ نییە بیکەینەوە، ئەمە باشترین ڕێگەیە.

بزەیەکی کرد و گوتی فەرموو بەردەوام بە.

من زۆر کەیفم هات لیلی حەز دەکات من بەردەوام بم. منیش لە خوام دەویست، چونکە بەرنامە بەرنامەی خۆمە و خۆم تێیدا دەرچووم.

قۆرتێکی بچووکم کرد و بیرە تازە شکاوەکەم خستە ناو قۆرتەکە و بەلم شاردمەوە. ئەوجا درێژەم دایێ:

سێ ڕێکخراو هەیە بەرنامەی دووەمی فولبڕایت دەبەن بەڕێوە. مەبەستم بەرنامەی فولبڕایتی قوتابیانی درەوە بۆ ئەمەریکا ڕێکخراوی ئامیدیست، کورتکراوەکەی ئەمەیە: خزمەتگوزارەیلی مەشق و پەروەردەیی ئەمەریکا و ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست. ڕێکخراوی ئای ئای ئی واتە: پەیمانگەی پەروەردەی نێودەوڵەتی. سێیەمیش ڕێکخراوی لاسپاوە. کورتکراوەکەی ئەمەیە: بەرنامەیلی پرۆفێشناڵ و ئەکادیمی بۆ ئەمەریکای باشوور و خواروو و ناوەڕاست.

لیلی سەری بڵند کرد و گوتی: کام ڕێکخراو لە عێراقدا کار دەکات.

"ئامیدیست".

لیلی سەری باشەی لەقاند و گوتی: دەتوانی باسی چۆنیەتیی تەقدیمکردنەکەم بۆ بکەیت؟

لە دڵەوە خەنی بووم کە لیلی هێشتا تاقەتی ماوە گوێم بۆ رادێرێت چونکە حەزم دەکرد ئاوا بەدرێژی باسی فولبرایت بکەم هەرکە یەکێك هەبووایە گوێی گرتبا. بۆیە گوتم:

بۆ نموونە لە عێراق ئامیدیست بەهاوکاریی باڵوێزخانەی ئەمەریکا لە بەغدا کار دەکات و ماڵپەڕێکیان هەیە تایبەت بەفولبرایت. ساڵانە رای دەگەیەنن و ماوەیەکی دیاری کراو دادەنێت بۆ وەرگرتنی فایلە تەقدیم کراوەکان. بێگومان هەموو شتێك ئۆنلاینە. پرۆسەیەکی درێژە و هەر هەموویشی لەسەر ئینتەرنێت ئەنجام دەدرێ. بەڕاستی سەبر و تەحەمولێکی زۆری دەوێت. بۆ نموونە کەیسی من نێزیکەی ساڵێکی خایاند.

"یەك ساڵ! بەڕاستی ئەمە زۆرە."

بەڵێ ئەمە زۆرە، بەڵام شایەنیەتی. دەزانی بوون بەفولبرایتەر چەندە گرینگ و بەنرخە. یەکەم جار لەسەر ماڵپەڕەکە ئەکاونتێك دەکەیەوە و فۆرمی تەقدیمکردن ئۆنلاین پڕ دەکەیتەوە. بێگومان فۆڕمەکە درێژە و چەندان وردەکاری تێدایە لەسەر خۆت و مێژووی پەروەردەت لەگەڵ نووسینی نامەیەکی کەسی و شیکردنەوەی ئەوەی بۆچی دەچیتە ئەمەریکا. هەروەها سێ نامەی پشتگیریشی دەوێ کە دەبێ لەلایەن مامۆستاکانت لە زانکۆ یان هەر کەسێك کە پێشتر تۆ کارت بۆی کردووە، بنووسرێ. ئەوانیش هەر دەبێ لەسەر ئینتەرنێت فۆڕمەکە پڕ بکەنەوە و بنێرن. چونکە تۆ نامەکە نابینی.

هەروەها دەبێ نمرەی تۆفڵت لە ٥٥٠ کەمتر نەبێ، چونکە ئەمەش داواکراوە هەرچەندە دواتر تاقیکردنەوەی تۆیفڵ و جی ئاڕ ئیت پێ دەکەن. دواتر چاوەڕێ دەکەیت تا وەڵامت دەدەنەوە بەئیمەیل کەوا شۆرتلیست کراوی یان نا. شۆرتلیست مانای وەرگیران نییە، بگرە پانێلێکی شەش کەسی دیمانەت دەکەن و چەند پرسیارێکت لێ دەکەن و دواتر هەردوو تاقیکردنەوەکە دەکەیت. دوای ئەمانە هەر بەئیمەیلێکت پێ دەڵێن کەوا تۆ دەبیتە کاندیدی سەرەکیی فولبرایت یان نا.

هەستت بەچی کرد کە ناوت دەرچوو، لیلی ئەمەی بەپەرۆشەوە پرسی و قوومێکی لە بیرە تازە شکاوەکەشی دا.

منیش بیرەکەم لە بن لم دەرهێنا و هەندێکم هەڵدا و گوتم: ئێستەش ئەو ساتەم لە بیرە کە ئیمەیلم کردەوە و ئیمەیلێکم لە باڵیۆزی ئەمەریکا لە عێراق بۆ هاتبوو کەوا پیرۆزبایی لێ کردم بەبۆنەی شۆرتلیست کردنم. ساتێکی ئێجگار خۆش بوو. هەموو ئەو کاتە دووروودرێژەم لە بیرچووەوە کە چاوەڕێم کردبوو.

لیلی دەستی لە ملی کردم و گوتی پیرۆزە هاوڕێکەم. بەڕاستی تۆ شایەنی ئەوەیت.

منیش بەدەم تەماشاکردنی زەریاوە سوپاسم کرد و هیوام بۆ خواست کە رۆژێ بێ ئەویش وەك من ببێتە فولبڕایتەر. دواتر گوتم: لیلی وێڕای هەموو ئەمانە دەتەوێ بزانی بۆچی پێی دەگوترێ فولبڕایت و ئەو ناوە لە کێ هاتووە؟

"بەڵێ بێگومان" بەردەوام بە، لیلی ئەمەی بەکەیف خۆشییەوە گوت.

لە ساڵی ١٩٤٦ لەسەر پێشنیازی سیناتۆر جەی ویلیەم فولبڕایت دامەزراوە. کەواتە بەناوی ئەو سیناتۆرەوە کراوە. دەزانی فولبڕایت چەندان مانای شاراوەی هەیە چونکە هەر لایەنی خوێندنەکەی نییە. لایەنە شاراوەکان ئەمانەن: لە یەکێك لە گوتەکانیدا، فولبڕایت دەڵێت "بەهێزکردنی سەرکردایەتی و فێربوون و لێکتێگەیشتنی نێوان کولتوورەکان ئامانجی سەرەکی بەرنامەی سکۆلەرشیپی نێودەوڵەتی بووە و ئەو ئامانجە هەر بەدەوام دەبێ."

بەهۆی فولبڕایت بابایەکی وەك من لە عێراق، یان هەر یەکێکی تر بۆ نموونە لەوپەڕی ئەفەریقیا، دەتوانێت لە بنج و بنەوانی کولتووری ئەمەریکی قووڵ بێتەوە و تێی بگات. هۆکاری سەرەکی ئەوەی کۆمەڵێك بیروبۆچوونی خراپ هەیە لەلایەن گەلانی تر بەرامبەر بە گەلی ئەمەریکا ئەوەیە کە بۆشاییەکی ئێجگار گەورە لە نێوانیاندا هەیە. ئەمە باشترین رێگەیە بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە و تێگەیشتن لە کولتووری یەکتری. ئەوەی دێ لێرە دەخوێنێت و دەژی، لە نێزیکەوە خەڵکی ئەمەریکا دەناسێت و فێرە کولتووریان دەبێ. هەروەها ئەو ئەمەریکییەی لە رێگەی فولبڕایتەوە

دەچێتە دەرەوە بێگومان فێرە کولتوورێکی نوێ دەبێت. ئەم هاوکێشەیە هەستی لێبوردن و یەکتری قەبوڵکردن زیاتر دەکا و تۆوی ئاشتی و تەبایی دەچێنێت.

لیلی سەری سوڕما بوو و بەدەم دانیشتەوە تەماشای شەپۆڵەکانی دەریای دەکرد، کە ئەمجارە تا نیوەی لەشمان دەهات و دواتر لێژ دەبوونەوە ناو دەریا. نیوەمان تەڕ و نیوەمان وشك. تەماشای کردم و گوتی: زۆر سوپاس.

منیش کردمە گاڵتە و گوتم: سوپاس بۆ بیرەکە یان بۆ فولێبڕایت.

لەسەرخۆ پێکەنی و گوتی بۆ هەردووکیان.

ئیتر بیرەکانمان تەواو کرد و سەرمەستانە چووینە ناو دەریا و خۆمان فێنك کردەوە، چونکە مایامی بەڕاستی گەرمە. بەتایبەتی ئەگەر کاتی نیوەڕۆیان بێت.

گەشتی مایامیم زۆر خۆش بوو. شەو چوومە نایتکلۆب تا چواری بەیانی، دواتر هاتمەوە هوتێلەکەم و بەپەلە خۆم ئامادە کرد بۆ فڕۆکەخانە و چونکە دەبوایە بگەڕێمەوە ویلایەتی کانزاس-شاری لۆرێنس چونکە زانکۆکەم لەوێ بوو.

بەحاڵ بەفڕۆکەکە گەیشتم، چونکە دواکەوتم. ئەو تەکسییەی منی گەیاند زۆر خێرا دەڕۆیشت، ئەو نەبایە فڕینەکەم لەدەست دەچوو. کە گەیشتمە ئەوێ چوار دۆلارم بەخشیش دا بە شوفێرەکە. کە بینیم دڵی خۆش بوو، منیش دواکەوتنەکەم بیر چووەوە. هەندێ جار تەنیا دۆلارێك دڵی مرۆڤێك خۆش دەکات، کەچی هێشتا مرۆڤ هەیە لەسەر ئەم زەوییە لە دەستی نابێتەوە دۆلارێك یارمەتی هەژاران بدات.

زۆر بەخێرایی گەیشتمە قاوشی چاوەڕێ کردن. لە تەنیشت ئافرەتێکی تەمەن ٤٠ ساڵانە دانیشتم. زۆر هیلاك بووم چونکە ئەو شەوە نەنووست بووم. ئافرەتەکە لێم بەدەنگ هات و گوتی: دیارە زۆر ماندووی.

نیگایەکم کرد و بەزەردەخەنەوە گوتم: بەڵێ، ئەوە مایامییە، ئیتر کەیف و خۆشی و نایتکلەب ناهێڵێت بنووی.

هێمنانە پێکەنی و گوتی: من جولیانم.

"من گۆرانم، دڵخۆشم بەناسینت."

جولیان پرسی: خەڵکی کوێی؟" هەرکە ئەلقەی دەستمی بینی، نەیهێشت وەڵام بدەمەوە و گوتی ئەها ژنت هێناوە.

گوتم: خەڵکی کوردستانی عێراقم، ژنم هێناوە و منداڵێکیشم هەیە، بەڵام لەگەڵمدا نین.

بەسەرسوڕمانەوە گوتی: دەبێ زۆر زەحمەت بێ بۆ تۆ. بێگومان بیریان دەکەیت ئێستە. چۆنە هەستی غەریبی؟

# ٣

## غەریبی بەهەشت دەکەم

هەستم کرد جولیان دەیەوێ هەستم بریندار بکا و بە ئەنقەست ماڵ و منداڵم بەبیر بێنێتەوە، زامی غەریبیم کول بکاتەوە. هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و گوتم: پیاوی خاوەن ماڵباتێکی بەختەوەر، تەبا و دڵخۆش بەیێکەوە خاوەن بەهەشتێکە لەسەر گۆی زەوی، بەهەشتێك راستەقینە.  دووربوون لێیان دووربوونە لە بەهەشت، بێ ئەو بەهەشتە پیاو ناتوانێ وا ئاسان هەڵبکات.

برۆ سیسباوەکانی بۆ نیشانەی سەرسوڕمان و تێڕامان بردە سەرەوە و گوتی: من زیاتر لە هەموو کەس لێت تێدەگەم لەبەرئەوەی هەمان شت بەسەرمندا هات کاتێ چوومە تایلەند بۆ ماوەی دوو ساڵ. ئەمەی گوت و بێ ئەوەی بهێڵێت زمانم بجووڵێنم، پرسی: منداڵەکەت کوڕە یان کچ؟

وەك بڵێی لەسەر قسەکردن کێبەرکێ بکەین، وەڵامێکی درێژم دایەوە. بەنیوە هەناسەیەکی خەمگین گوتم: کوڕە، ناوی (لۆهان)ە و تەمەنی سێ ساڵە. هەر منداڵێکی تەمەن سێ ساڵ دەبینم، ئەوم دێتە پێش چاو. هەرکە بەلای باخچەیەکی منداڵاندا تێپەڕ دەبم، دڵم پڕ دەبێت لە دەرزی، جەرگم کزەی لێوە دێ و تایەکی گران هەموو لەشم دادەپۆشێ. دەمەوێ یەك بەخۆم هاوار بکەم و بگریم و کەللەم بدەم لە دیوار تا مێشکم دەپژێ.

نەمهێشت پرسیاری تر بکات و بەردەوام بووم. گوتم جولیان باری سۆزداریم لاسەنگە، بەشێوەیەك کە هەندێ جار دێتە سەرم پلیتی باڵەفڕگە ببڕم و بفڕم بۆ ماڵ، ماڵێك شاد و بەهەشتئاسا. دێتە سەرم هەرچی هەیە لێرە بەجێ بێڵم و بچمەوە بەهەشت، بەهەشتێك لە ناو جەرگەی دۆزەخ! لۆهان هەموو رۆژێ سەعات چوار و نیوی ئێوارە چاوەڕێم دەکا، چاوەڕێیەکی سەرابی. پێش بفڕم بۆ ئەمەریکا، رۆژانە

سەعات چوار لە کار تەواو دەبووم و چوار و نیو لە ماڵ بووم. هەرکە چاوم پێی دەکەوت هەرچی ماندووبوون و شەڕە سە و بارگرانی کار هەبوایە لە بیرم دەچوو، وەك بڵێی یادگەم خاڵی بێت و هیچم لە بیر نەمێنێت. چوار و نیوی هەموو ئێوارەیەك بۆ من لە شیشدانی روح و دەروونمە، لە ناخەوە دەسووتێم.

لە کێبەرکێی قسەکردن بەردەوام بووم، نەمهێشت دەمی بجووڵێنێ و گوتم نەبادا ئێستە وابزانێ تەنێ بیری کوڕەکەم دەکەم. بۆیە یەکسەر دەستم کرد بەباسکردنی خێزانەکەم. گەرووم پڕ بووبوو لە کلپەی گریان و گوتم: جاری وا هەیە لەسەر زەوی پاڵ دەکەوم و هۆڕ هۆڕ بۆ خێزانەکەم دەگریم. تا سەر ئێسقان بیری دەکەم، هەندێ جار هەست دەکەم ئێسقانەکانم وا کون دەبن و تێکوپێك دەشکێن. ناتوانم لەسەر پێ یان سمت لەنگەر بگرم. بۆ ماوەیەك نەخۆشی ئێسکەنەرمە دەمگرێ. بیری هەموو ساتێکی بەهەشت دەکەم، خێزان و کوڕەکەم بەهەشتێکن بێ بن بۆ من. هەندێ جار هەستی تاوان دەمکوژێ. خۆم دێتە پێش چاو وەك تاوانبارێك سەت کیژۆڵە بکوژێت و ئەوجا دواتر سێکسیان لەگەڵدا بکات. هەندێ جار پارچەپارچە کردنم وەك ولیەم والاس دەرهەك بەخۆم دەزانم. من ئەوانم لە بارودۆخێکی دژوار و سەختدا بەجێ هێشت.

جولیان، کە وەك من چاو پڕ لە گریان و گەروو پڕ لە کلپە، بەدەنگێکی نزم و گریاناوی پرسی: بۆ وا هەست دەکەی، بەدەستهێنانی بڕوانامەکەت هەر تەنێ بۆ خۆت نییە، بۆ ئەوانیشە. داهاتووی ئەوانیشی پێوە بەندە. پێم بڵێ باری ئەوان ئێستە بۆ سەخت و دژوارە.

جولیان هەوڵی دا دڵم بداتەوە و تۆزێك لە گرانایی لەشم کەم بکاتەوە. بەڵام هەستی غەریبیم لەوە زۆر گەورەتر و بەتێنتر بوو. دوای هەناسەیەکی قووڵ، گوتم: مانگێك پێش بفرم بۆ ئێرە، دەمەو و خۆرئاوابوون دکتۆر پێی گوتین: پیرۆزە! هەردووکمان زانیمان کەوا سکپڕبوونەکە لە کاتێکی نەشیاو رووی تێمان کرد. ئەو سکپڕییەی بەپلان نەبوو، هەڵەیەك بوو کردمان و لەدەستمان چوو. من زۆر تێکچووم و خەریك بوو لە داخا بتەقمەوە، بەڵام خێزانەکەم، کانی، هەستی پێکردم و خێرا گوتی: دڵت هیچ نەکات، زۆر ئاساییە، دەبێ سوپاسی خوا بکەین، من دەتوانم بەرگەی ئەمە

بگرم ئەگەر تۆش لێرە نەبیت، چونکە دەزانم تۆ بۆ شتێکی گەورە دەڕۆی، بۆیە نەکەی بەمە پەرێشان بیت.

جولیان سەروسیمای گەش بوویەوە. خەنییەوە و گوتی: ژنێك فریشتەئاسا! کەس ئەوە لە مێردەکەی ناکرێت. بەڵام تۆ بەخت یاوەرتە. ئێستە دەزانم بۆچی هێندەیان غەریبی دەکەی. ئێستە درك بەوە دەکەم کە بەڕاستی تۆ بەهەشتت بەجێ هێشتووە. پێ دەچێت کانی ئافرەتێکی بەهێز بێت.

دڵخۆش بووم بەوەی جولیان زانی من باسی چی دەکەم و بۆچی دەناڵێنم. دەم نێزیکە گزنگی بەیان بوو. تەواوی سەرنشینانی ناو باڵەفڕگەکە خەوتبوون. لای من وەك ئەوە بوو هەریەك لەوان بیر لە ماڵ و منداڵی دەکاتەوە و غەریبی ئەو بەهەشتە دەکات بەجێی هێشتووە. بەڵام کەسیان وەك  من ماڵوێران و غەریب نەبوو، ئەوان نێزیکە بەهەشت و من دوور، تا بڵێی دوور.

خوا جولیانی بۆ من نارد بوو، چونکە بەو بەیانییە کەس تاقەتی ئەوەی نییە گوێ لە چیرۆکی یەکێك بگرێ پڕ لە سۆز و نەهامەتی و گریان. هەریەك تاقەتی هەبووایە گوێم لێ بگرێ، ئیتر نەمدەبڕییەوە و کەڕ و کاسم دەکرد، چونکە دڵم هەردەم پڕ بوو لە حەسرەت پێویستی بەڕشتن هەبوو. ئێمەی گەلانی ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست وا تێگەیشتووین، کە ئەمەریکاییەکان گوێ لە سۆزی کەس ناگرن و هەر خۆیان لا گرینگە و بایەخ بە گرفتی ڕۆژانەی خۆیان دەدەن و بەس، چ کاریان بەبابایەکی وەك من هەیە غەریبی بەهەشت بکەم یان نەکەم. بەڵام ئەمە بۆچوونێکی هەڵەیە، ئەمەریکاییەکان گوێ لە خەڵك دەگرن و تەنانەت حەز دەکەن بزانن ئەو خەڵکەی ئەودیو زەریاکان چۆن بیر دەکەنەوە و چۆن دەژین.

ئەو چیرۆکەی من بۆچوونی ئەمەریکاییەکانیش دەگۆڕێت لەسەر گەلانی ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست. من لە ڕێگەی چیرۆکی غەریبی کردنی بەهەشتەوە بەجولیان و ئەمەریکا دەڵێم کەوا گەلانی ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست تیرۆریست نین، بگرە قوربانی دەستی تیرۆرن. تیرۆر لە ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست زادەی کەمینەیەکی بێ ئەقڵ، شەیتانئاسا، بێ

دین، خوا نەناس و پارە و دەسەلاّت پەرستە. تیرۆر لە هەناوی گەلانی رۆهەلاّتی ناوەڕاست جێی نەبووەتەوە و نابێتەوە. ئەگەر من گوتم خەڵکی عێراق، ئەفغانستان، لبنان، سوریا یان ئێرانم مانای ئەوەی نییە من تیرۆریست بم. تیرۆریست نە ولاّتی هەیە، نە دنیای هەیە، نە دینی هەیە نە خوا. کەمینەیەکی پیسی ناجۆری نەفس نزمی بێ بەهای هیچوپوچ ناتوانێ وا لە ئەمەریکاییەکان بکات بە هەڵە لە ئێمەی رۆهەلاّتی بگەن. پێچەوانەکەشی راستە، کەمینەیەکی ئەمەریکایی بێ بەها و رەوشت و ئەخلاق ناتوانێ وا لە ئێمەی رۆهەلاّتی بکات بە هەڵە لەو گەلە تێبگەین کە ئاگایان لە هیچ نییە جگە لە مژوولبوون و سەرقاڵی ژیانی خۆیان نەبێ. ئەگەر بێو سەیری گەلانی دنیا بکەیت، هەمووی لە خاڵێکدا یەك دەگرنەوە: خاڵی بەرائەت. گەلانی دنیا هەر هەمووی قوربانی دەستی سیاسەتی چەپەڵی ئەم سەردەمەن و کوشتەی دەستی سەرمایەداری، جیهانگیری و تیرۆریزم و شەڕی حوکمڕانەکانن لەسەر پارە و دەسەلاّت.

رووم لە جولیان کرد و بەردەوام بووم: بیری ئەو ساتانە دەکەم کە خۆم دەکردە کەر و کوڕەکەم و لەسەر پشتم حەچەی دەکرد. بیری ئەو ساتانە دەکەم و چاوشارکێنم دەکرد لەگەڵ کوڕەکەم و خێزانەکەم. هەموو جار خۆم لە بن مێزی نان خواردن دەشاردەوە، هەرکە کوڕەکەم منی دەدیتەوە پڕ بەدەمی پێ دەکەنی و قاقای دەگەیشتە ئاسمانەکان. بیری ئەو ساتانە دەکەم کە لەگەڵ کوڕەکەم دەعمانێمان دەکرد بەسەیارە لە مۆڵەکانی هەولێر. من دەتوانم دەری ببڕم، ئەوەتا تۆ گوێم لێ دەگری و هەرچی هەیە لە دڵم هەڵدەڕێژم، بەلاّم کوڕەکەم ئەو زمانەی نییە باسی ئەو غەریبییە بکات. بەلاّم کانی دەڵێ بەهەڵسوکەوت دەریدەبڕێ.

جولیان قسەی پێ بڕیم و پرسی: باشە بۆچی لەگەڵت نەهاتن؟

بۆ چەند چرکەیەك مات بووم، لە پەنجەرەی باڵەفڕگەکەوە تەماشای دەرەوەم کرد، تەنێ سەیری بۆشاییی ئاسمان و تاریکیم دیت. قووڵ بە نێو تاریکاییدا روانیم و هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و گوتم: فولبڕایتەری عێراقی بۆیان نییە ماڵ و منداڵ لەگەڵ خۆیاندا بێنن.

جولیان بە سەرسڕمانەوە گوتی: ئەمە نامۆیە، ئەو هەموو کەسە ساڵانە روو لێرە دەکەن، حکوومەت نایانوەستێنێت، یان ناتوانێ بیانوەستێنێت، کەچی فولبڕایتەرێکی وەك تۆ، بلیمەتی وڵاتی خۆت، چۆن ناهێڵن. ئەمە کارێکی شێتانەیە دەیکەن.

گوتم: راستە، زۆر هەوڵم دا. چەندان ئیمەیڵم بۆ سپۆنسەرەکەم رەوان کرد، بەڵام لێمیان نەکرِی. بەهەموو شێوەیەك بۆیانم شیکردەوە کەوا من باری سۆزداریم لاسەنگە و ئەمە کار دەکاتە سەر خوێندنەکەم. بەڵام کەس لێمی نەکرِی. لە دوا ئیمەیڵدا پێیان گوتم: ئەم بڕیارە لە دەست ئێمەدا نییە، ئەوە بڕیاری وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکایە. ئیتر ماندوو بووم، بۆ ئەوەی کاتی خۆمی پێوە نەکوژم و وازم هێنا. بەڵام بیرم لە پلان بی (B) کردەوە: بڕیارمدا بەساڵێك تەواو بکەم لەجیاتی دوو ساڵ. ئێستە لە ئابی دابێ تەواو دەبم و دەتوانم بە یەکجاری بگەڕێمەوە، بەڵام دیسێمبەری دابێ دەردەچم، کە ئەمەش ئاساییە.

جولیان حەپەسا، رەنگی پەڕی، خێرا گوتی: چۆن دەتوانی بەیەك ساڵ ماستەر تەواو بکەیت. ئەمە زۆر زۆرە.

خەنیمەوە و گوتم: لە پێناو بەهەشت دەتوانم ئەمە بکەم! تا ئێستە زۆر باشم لە وانەکان، هەرچەندە زۆر قورسە.

ئەوەم گوت و گەڕامەوە سەر ساتە مەزنەکان. گەرووم پاك کردەوە و گوتم: شەو نییە رانەپەڕم و رانەچڵەکم بەدەنگی کوڕەکەم یان خێزانەکەم. شەو هەیە تا بەیانی خەو ناچێتە چاوم. بیری ساتە مەزنەکان پێدا پێدا دەمخوا، هەست دەکەم غەریبی بووەتە دڕندەیەك و قەپاڵ قەپاڵ لە لەشم لێ دەکاتەوە و دەمخوات. شەو هەیە دەگەوزێم لە ناو فرمێسك و ئارەقەم کاتێ رادەچڵەکەم خەونە. بۆیە سوپاسی خوا دەکەم کە لەدەستدانی کوڕەکەم یان خێزانەکەم خەون بوو. شەو هەیە یەك بەخۆم پێدەکەنم، پێکەنین بەساتە گاڵتەوگەپئامێزەکان لەگەڵ ماڵباتەکەم.

جولیان دەستی بەبن چەناگەوە گرتبوو، بیرکردنەوەیەکی قووڵ دایگرت بوو وەك بڵێی قسەکانم بووبوونە ئیلهامێك بۆ بیرکردنەوەی. هەرکە زانی من وەستام، یەکسەر پرسی ئەی پێوەندییان لەگەڵ دەکەی بەتەلەفۆن یان...؟

خێرا گوتم بەڵێ سەردەمی ئینتەرنێت کارەکەی تۆزێك ئاسان کردووە. نێزیکەی هەموو رۆژێك بە سکایپ، دەنگ و رەنگ قسەیان لەگەڵ دەکەم. ئەگەر ئەوە نەبوایە، ئێستا تواببوومەوە: بووبووم بەخۆڵەمێش. هەرچەندە ئینتەرنێت لە کوردستان زۆر خراپە، بەڵام لە نەبوون زۆر باشترە. قۆرخکردنی ئینتەرنێت ناهێڵێت گەل ئینتەرنێتی خێرا وەرگرێت. چەند کۆمپانیایەکن دەستیان بەسەردا گرتووە: ئەمە نەخۆشییێکی گەورەیە.

جولیان بەمە نیگەران بوو، هیوای خواست هەموو شتێك باش بێت و بتوانم زیاتر بەرگە بگرم.

ئیتر هەردووکمان ماندوو بووین. بەڵام بەختێکی باشمان هەبوو کەوتینە تەنیشت یەکتر لەناو باڵەفڕگە. ئەگینا ئەو هەموو خیزاوەی ناو هەناوم بەتاڵ نەدەبوو.

من چاوم لێك ناو و خەو بۆ ساتە مەزنەکانی نێو بەهەشتی راستەقینەی خۆمی بردمەوە. چوومەوە لای لۆهان و کانی. خەو بۆ دنیا بچووکەکانی بردمەوە کە لەگەڵ کوڕەکەم پێیان پێ دەکەنین. لە خەومدا وام هەست کرد ئەو باڵەفڕگەیەی لە مایامی پێی دەچمەوە کانزاس، رێڕەوی خۆی گۆڕی و رای گەیاند بەرەو کوردستان دەچێت. خۆشترین خەونم بوو لە ژیانمدا، هەستم کرد سەرنشینانی تریش پێیان خۆش بوو و حەزیان دەکرد بێن ماڵباتەکەم ببینن و بزانن بەهەشتی راستەقینە چۆنە.

بە دەنگی فڕۆکەوانەکە واگا هاتم کە گوتی کورسییەکانتان قیت بکەنەوە و قایشەکانتان توونـد بکەنەوە و بیست دەقیقەی تر دەنیشینەوە. هەر بە ڕەبەی خەونەکە، وامزانی لە کوردستان دەنیشینەوە. بەڵام کە هەستم کرد ئێمە دەچینەوە کانزاس، ئەگەر بێو راست بووایە لەوانەیە سەرنشینانی باڵەفڕگەکە بە بارمتەگرتنی باڵەفڕگەکە تێگەیشتبان، ئەگینا بۆچی لە مایامییەوە دەچێ لە کوردستان دەنیشێ. ئەم خەونە

نابێتە راستی. ئیتر هەناسەیەکی قووڵی پڕ لە حەسرەتم هەڵکێشا و کورسییەکەم راست کردەوە و قایشەکەم تووند کرد.

تازە یەکەم تیشکی خۆر پەرش بووبووەوە. گزنگی بەیان بوو. دنیا ساف و بێگەرد، بێ دەنگ و ئارام. من بەمە سەرگران بووم، حەزم دەکرد بنوومەوە تا بە خەونەکە را بگەم و لە کوردستان بنیشم. بەڵام ئەمە هەر حەز بوو.

هێندەی نەبرد باڵەفڕگەکە نیشت و سەرنشینان دابەزین و من و جولیان ماڵئاواییامان لە یەکتر کرد و هیوای سەرکەوتنمان بۆ یەکتری خواست. خەڵك بەرەو ماڵ دەبووەوە، بەرەو بەهەشتی خۆی، منیش بەرەو ماڵێکی سارد و سڕی دوور لە بەهەشت. وەك هەموو جار خۆم دڵی خۆم دایەوە و لە ناخەوە هێزێکی بەتێن دایگرتم کە دەبێ ئەمە بەسەرکەوتوویی تەواو بکەم و جارێ غەریبی لە بیر بکەم. تاقەتێکی باشم هەبوو بۆ بەرگەگرتن و خوا ئارامی پێ دەبەخشیم، هەموو رۆژ هەستم بەوە دەکرد.

★★★

دوای ئەوەی گەیشتمەوە ماڵ، یەکسەر نووستم، چونکە شەوی رابردوو خەوی تەواوم نەکردبوو. ئێوارەی رۆژی دواتر داوەت بووم لە جەژنی لەدایك بوونی هاوڕێ دڵسۆزە ئەمەریکاییەکەم، تۆماس.

ئالیسی هاوڕێم هاتە دوام لە کۆلێژ و پێکەوە چووین بەدوای میشیل و دوای پێنج خولەك گەیشتینە ماڵی دایکی تۆماس، لەوێ ئاهەنگی لەدایکبوونەکە بەڕێوە دەچوو. دایکی تۆماس ئافرەتێکی پیر، میهرەبان و لەسەرخۆ بوو. ماڵێکی ئارام و هێمن و پڕ لە هونەری هەبوو. پیرۆزباییمان لە تۆماس کرد و دەستمان کرد بە بیرە خواردنەوە و پیدزا و گفتوگۆ. هێمنیی دایکی تۆماس، دایکمی بیر خستەوە. ئەمە هەناسەیەکی خۆشی دامێ.

دواتر ژن و مێردێکی ئەمەریکایی گەنج دەرکەوتن و پیرۆزبایییان لە تۆماس کرد و دانیشتن. هەرکە زانیم ئەوانە ژن و مێردن زۆر دڵخۆش بووم. یەکەم جارم بوو لە ئەمەریکا ژن و مێردێکی گەنج ببینم. ئەو ڕۆژە سێیەم هەفتەی قەفەسی زێڕینیان بوو، تەمەنیان ٢٥ ساڵ بوو. چەندان گەنجی ترم ناسی لەوێ، هەموو هاوڕێی تۆماسی هاوڕێم بوون. هەر یەکەیان لە بوارێکی جیا لەوەی من دەیخوێند: تەلارسازی، فەلسەفە، یاسا و تاد.

دەمێك بوو دەمویست بزانم هاوڕێیەتیی نێوان کوڕ و کچ چۆنە لە ئەمەریکا. چ ئاستێك هاوڕێیەتییە و کەی پێوەندییەکە دەبێتە سێکس.

بێ دەنگییێك ئەو ناوەی داپۆشی. منیش سوودم لەو بێ دەنگییە وەرگرت. پرسیارەکانم لە جۆن کرد کە لەو ئاهەنگە یەکتریمان ناسی. گەنجێکی کراوە و حەز بە سوالفان بوو.

# ٤

# قاوه خواردنەوە و سێکس

ئێمەی گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وا لە ئەمەریکاییەکان گەیشتووین کە سێکس لای ئەوان زۆر ئاسانە. وا تێگەیشتووین دوای یەکەم قاوه خواردنەوە لەگەڵ کچێك، هانکەهانك و راموسان و سێکس دەست پێ دەکات. گەلی ئەمەریکی بوونەتە قوربانی دەستی فیلمەیلی هۆلیوود. فیلمەکان رووێکی تری گەلی ئەمەریکی پێشان دەدەن. خەڵك لە ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست وا دەزانێ لە ڕۆژئاوا، بەتایبەتی لە ئەمەریکا، سێکس لەسەر شەقامەکان دەکرێ و دەتوانی هەرچی بیگەیتێ هەرچی لەگەڵ بکەی ئاساییە. ڕۆژهەڵاتییەکان وا دەزانن هاوسەرگیری لە ئەمەریکا باوی نەماوە و دنیا تەنێ رووتمەنی و سێکس و لادان لە بەهاکانە لەوێ. وا تێگەیشتوون ماڵبات لە ئەمەریکا هەڵوەشاوەتەوە. ژیانی بێ ماڵبات وشکە وەك بیابان. ئەمە تا رادەیەك راستە لای نەوەی نوێ و مۆدێرنی ئەمەریکایی.

بەپێچەوانەشەوە، ئەمەریکاییەکان وا لە ڕۆژهەڵاتییەکان گەیشتوون کە سێکس لای ئەوان تاوانێکی گەورەیە. وایان تێگەیشتوون کچ و کوڕ کەم یەکتر دەبینن و دیتنی دوو رووالْ کارێکە بڤە. ڕۆژهەڵاتییەکان بوونەتە قوربانی دەستی ئەو رەوتە ئیسلامییە سیاسییانەی کە ژیانیان بە خەڵکی مەدەنی تاڵ کردووە. وێنەیەکی تریان لە بیری ڕۆژئاوا دروست کردووە لەسەر موسلمانان و خودی ئیسلامیش. ڕۆژئاوا وا دەزانن ڕۆژهەڵاتییەکان هیچ حسێب بۆ ئافرەت ناکەن و ڕێزی لێ نانێن. وایان تێگەیشتوون کە ماڵباتیان زۆر یەکگرتووە لە ژێر سایەی سیستمێکی پیاوسالاری توندڕۆدا. ئەمەش تا رادەیەك راستە لای نەوەی کۆنی ڕۆژهەڵاتییەکان، بەڵام شتەکان گۆڕاون لای نەوەی نوێ، هەرچەند گۆڕانەکە سست و هێواشە.

ئەگەر بیری رۆژهەڵاتییەکان بخوێنینەوە، دەبینین بەم شێوەیە پەیکەرێك دەکێشێ بۆ پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی رۆژئاوا و ئەمەریکا: سەگ و پشیلە بەپلەی یەکەم دێن و لە سەرووی هەموو بوونەوەرەکانی ترن. ئافرەت بەپلەی دووەم دێ. دوای ئەوە منداڵ. پیاو بەپلەی چوارەم دێ. دوا شت کە حسێبی بۆ بکەن کەسانی پیر و بەساڵاچووە. ئەمە واتە کۆمەڵگەی ئەمەریکی زۆر رێزی سەگ و پشیلە دەگرن زیاتر لە هەر بوونەوەرێکی تر. ئاژەڵیان پێ لە مرۆ چاتر و رێزدارترە. دەبینین پیاو ئەوەندە حسێبی بۆ ناکرێ لە کۆمەڵگەی ئەمەریکاییدا.

ئەگەر بیری رۆژئاواییەکانیش بخوێنینەوە، دەبینین بەم شێوەیە پەیکەرێك دەکێشن بۆ پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی رۆژهەڵاتییەکان، بەتایبەتی رۆهەڵاتی ناوەڕاست: بەپلەی یەکەم پیر و بەساڵاچووان (بەتایبەتی نێر). پیاو بەپلەی دووەم دێ، ئەوجا منداڵ. دواتر ئافرەت. ئاژەڵ هیچ حسێبێکی بۆ ناکرێ. رۆهەڵاتی تا بۆیان بلوێ پشیلە دەکوژن، سەگ بەخێو دەکەن بەڵام لە دەرەوە. بەهیچ شێوەیەك بێزیان نایێ سەگ بێننە ژوورەوە و لەگەڵیان نان بخوا و بنوێ. هەموو دەسەڵات و رێزێك بۆ پیاوە و ئافرەت دەچەوسێنرێتەوە لە لای رۆژهەڵاتییەکان. ئەمەش تا رادەیەك راستە.

★★★

ئەو دەمەی تەواوی میوانەکان بێ دەنگیان شکاند و کەوتنەوە گۆ، جۆن کورسییێکی هێنا پێش بۆ ئەوەی لە نێزیکەوە قسەم بۆ بکات، گوتی: شتێك هەیە لە ئەمەریکا پێی دەڵێن "سێکسی شەوی یەکەم". زۆر کچ و کوڕ هەیە دوای یەکەم چوونەدەر سێکس دەکەن. هەیە دوای چەند چوونەدەرێك ئەوجا سێکس دەکەن. ئەوانەشی کە سێکس ناکەن، تەنیا وەك دوو هاوڕێ پێکەوە دەبن.

ئەی هاوسەرگیری؟ ئەوانەی سێکس دەکەن دوای چەند ژوانێك هاوسەرگیری دەکەن؟ من پرسیم.

جۆن قەمپارێکی لە پیزاکەی دا و دواتر قومێك بیرەی بەسەردا کرد، ئەوجا گوتی: مەرج نییە. کەپڵ هەیە چەند ساڵێك پێکەوە دەبن. ئەگەر زانیان لەگەڵ یەکتری دەگونجێن ئەوا زەواج دەکەن، ئەگەر نا نایکەن و جیا دەبنەوە.

قومێك ئاوم خواردەوە و پرسیم: جۆن پێم بڵێ بۆچی زەواج لێرە زۆر سەر ناگرێت؟ ئەوانەی تا ئێستە من لە ئەمەریکا ناسیومن یان باوەڕی بەزەواج نییە، یان هێشتا زەواجی نەکردووە، یان تەڵاق دراوە یانیش چەندان کچی بەرێ کردووە بێ ئەوەی زەواج بکات.

جۆن هەناسەیەکی هەڵکێشا و بەپێکەنینەوە گوتی: دەزانی تۆ بەلاش لە بەشی رۆژنامەوانی نیت، رێك رۆژنامەنووسانە پرسیار دەکەیت. ئەوجا وەڵامی پرسیارەکەمی دایەوە: کەس حەزی لەوە نییە ماڵی لێ تێك بچێت. هیچ ئەمەریکییەك دڵخۆش نییە بەلێك جیابوونەوە و تەڵاق، بەڵام چەند هۆکارێك هەیە وا لە ئەمەریکاییەکان دەکەن بگەن بەو رۆژە.

من یەکسەر بیرم لەوە کردەوە کە رۆژهەڵاتییەکان وا لە ئەمەریکاییەکان گەیشتوون کە تەڵاق زۆر گرینگ نییە لای ئەوان و هەر کاتێك بیانەوێ دەیکەن و زۆر ئاسانە و گوێی پێ نادەن. بۆیە گوتم: جۆن حەز دەکەم ئەو هۆکارانە بزانم.

جۆن، قوومێکی لە بیرەکەی بەردەمی دا و گوتی: هۆکاری سەرەکیی تەڵاق و لێك جیابوونەوە باری ئابوورییە. کەپڵ هەیە ناتوانن کرێی خانوو بدەن و کاریان نییە. کەپڵ هەیە بەهۆی دوو شوێنی کاری دوور لە یەکتر، مەبەستم یەکێك لە ویلایەتێکی ناوەڕاست و یەکێکیش لە ویلایەتێکی باشوور ئیشی دەست دەکەوێ، ئیتر ئەو دوورییە وایان لێ دەکات لە یەکتر جیا ببنەوە. کەپڵ هەیە بەگەنجی یەکتریان خۆشویستووە، ئیتر ئێستا لە یەکتر بێزار بوونە، یانیش ئەوەتا لە یەکتری ناگەن و لێك جیا دەبنەوە. زۆر پیاو هەیە ژنەکەی تەڵاق دەدا لەبەرئەوەی قەڵەو بووە و ئیتر چی تر زەوقی سێکسی لەگەڵ نامێنێت. ئیتر هۆکار زۆرە، کەپڵ هەیە لەسەر شتی زۆر سادە و بێ مانا لە یەکتر جیادەبنەوە. لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە: ئێستە لای ئافرەتی ئەمەریکایی بووەتە مۆدیل کە دوای چەند ساڵێك داوای تەڵاق بکات بۆ ئەوەی هەرچی هەیانە و نییانە دابەشی بکەن و مێردەکەشی لە هەندێ حاڵەتەدا یاسا ناچاری دەکات مانگانەیەك بۆ ژنەکە ببڕێتەوە!

چووم پارچەیەك پیزای ترم هێنا لەو کۆمەڵە پیزایەی لەسەر مێزێك زۆر بەجوانی دانرا بوون. ئیتر ماڵەکە جمەی دەهات لە خەڵك. زانیم جۆن کەمێك بێ تاقەت بووە، یەکسەر گوتم: زۆر سوپاس جۆن، جارێ بەیارمەتیت. چوومە بالکۆنەی ئاپارتمانەکە کە بەسەر تەواوی ئەو گەڕەکەدا دەیڕوانی، چونکە لە قاتی چوارەمدا بوو. کزە بایەکی فێنك دەهات و دنیا کش و مات بوو. لەوێ تەماشای شاری لۆرێنسم دەکرد کە بە گلۆپ رازابووەوە.

بیرم لە خەڵکی ئەمەریکا و رۆهەڵاتی ناوەڕاست دەکردەوە. زەواج لە رۆهەڵاتی ناوەڕاست تا رادەیەك خۆی دەگرێ، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە کەپلەکە دڵیان پێکەوە خۆش بێت. ئافرەت لە رۆهەڵاتی ناوەڕاست یەك کارتی هەیە لە ژیان، ئەویش مێردکردنە. ئەگەر مێردێکی باشی بەدەست کەوێ، ئەوا ژیانی لێ دەبێتە بەهەشت و بەپێچەوانەش لێی دەبێتە دۆزەخ. ئافرەتی تەڵاقدراو لە رۆهەڵاتی ناوەڕاست، بەتایبەتی لە عێراق چانسی شووکردنەوەی زۆر زەحمەتە لەبەرئەوەی خەڵك بەخراپی تێ دەگات. بەڵام لە ئەمەریکا ئەو چانسە زیاترە. ئافرەت لە رۆهەڵاتی ناوەڕاست خاوەن ئابوورییێکی سەربەخۆ نییە، زۆربەیان کار ناکەن و مانگانە هیچ داهاتێکیان نییە، بۆیە هەردەم لە ژێر دەستی باوك، برا، یان مێرددا دەژین. بەڵام لە ئەمەریکا ئافرەت خاوەن ئابووریی سەربەخۆی خۆیەتی و چانسی کارکردنی زۆر زیاترە.

لەو بیرکردنەوە قووڵەدا بووم، دەنگێك لە پشتەوە چاك و چۆنی لەگەڵ کردم. رووم وەرسووڕاند، کارلای هاوڕێم بوو. ئەویش هاتە بالکۆنەکە و لە تەنیشت من وەستا و وەك من دەستی بەسەر شیشەکاندادا. گوتی: دەزانی جەوت خۆشە لێرە، بیر لە چی دەکەیەوە؟

لەبەر تاریکی بەئاستەم دەموچاوی کارلام دەدیت. هەناسەیەکم هەڵکێشا و گوتم: بیر لە تۆ دەکەمەوە!

کارلا پێکەنی و بەتاسێکەوە گوتی: لە من! بۆچی؟ چی بووە؟ پێم بڵێ.

گوتم نا بیرت بۆ هیچ نەچێ، بیر لە ئافرەتی ئێرە و لای خۆمان دەکەمەوە. ئاسمان و ڕێسمانیان بەینە.

کارلا تەماشایەکی کردم و گوتی: مەبەستت چییە؟ ئافرەتی لای ئێوە چۆنن؟

خۆم قیت کردەوە و دەستم لەسەر شیشەکان هەڵگرت و پشتم بە دەرگەی بالکۆنەکەوەنا و گوتم: ئافرەت لە ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست زۆر داماوە. زۆربەی کاتی وەك زیندان دەباتە سەر.

کارلا بەپەرۆشەوە پرسی: پیٚم بڵیٚ لای ئیٚوە کوڕ و کچ چۆن یەکتری دەبینین؟

سەرم سڕما چۆن کارلا هەمان پرسیاری من بۆ جۆن بۆ خۆم دووبارە دەکاتەوە، وەك بڵیٚی جۆن یەکسەر دوای من بۆ کارلای گیٚڕابیٚتەوە. گوتم: لە کوردستانی عیٚراق کوڕ و کچ بەنهیٚنی ژوان دادەنیٚن و یەکتری دەبینن. هەرچەندە ئیٚستا تۆزیٚك ڕەوشەکە گۆڕاوە، بەڵام ئیٚستەش باوك و برا بزانن کچەکەیان یان خوشکەکەیان ژوانی هەیە لەگەڵ کوڕیٚك ئەوا بەشی کچەکە یان لیٚدانە، زیندانی کردنە لە دەرەوە و ناهیٚڵن چی تر بچیٚتە دەرەوە یان هەردووکیانە. زۆرجار لەوەش زیاتر ئەوەیە کچەکە دیٚتە کوشتن بەنهیٚنی. ئەمە پیٚی دەڵیٚن کوشتن لەسەر شەرەف.

کارلا واقی وڕما و ژانەسەر گرتی. بۆیە یەکسەر بابەتەکەم گۆڕی و پرسیم: لەوانەیە ئەم پرسیارە زۆر شەخسی بیٚ، بەڵام دەیکەم، تۆ شووت کردووە؟

گوتی: نەخیٚر. ژوانم لەگەڵ کوڕیٚك دەبەست، بەڵام پارساڵ لە یەکتر جیا بووینەوە.

گوتم بۆچی؟

کارلا هەناسەیەکی ساردی هەڵکیٚشا و بەدەنگیٚکی پڕ لە حەسرەتەوە گوتی: ئەو سەرەتا زۆر باش بوو و هەردووکمان پیٚکەوە مورتاح بووین، بەڵام دواتر ڕۆژ دوای ڕۆژ شیٚتتر دەبوو و هەڵسوکەوتی بەرامبەرم گۆڕا.

سەرم خوراند و گوتم: کارلا لیٚم مەگرە بەڵام زیاتر پرسیارەکەم قووڵ دەکەمەوە. بۆ من هەموو شتیٚك لەبارەی کولتووری ئیٚوە نوییە، بۆیە ئەگەر پرسیارەکانم زۆر کەسانی بوون، ئەوا دەبیٚ بەدڵیٚکی فراوان وەریان بگری، چونکە من دەمەویٚ لەو کولتوورە تیٚ بگەم.

پیٚکەنی و گوتی: نا ئاساییە.

"بەڕای تۆ جیابوونەوە دوای خۆشویستن و سیٚکسکردن لەگەڵ کوڕیٚك، کاریگەری نابیٚ لەسەر شکۆمەندی و کەسایەتی و باری دەروونی تۆ؟ چونکە لای ئیٚمە کچ خۆی تەسلیم بەکوڕ ناکات، ئەگەر بیکات و کوڕەکە دواتر بەجیٚی بیٚلیٚت ئەوا هەموو شتیٚك لە دەست دەدا," گوتم.

"زۆر ناخۆشە و ئەوپەڕی دڵتەنگییە،" کارلا گوتی. "دەزانی لە ناخەوە تێکوپێك دەشکێی کاتێ یەکێك وازت لێ دەهێنێ دوای ئەو هەموو خۆشەویستی و سێکسکردنە."

دواتر کارلا کردی بەگاڵتە و گوتی، "ئەو کوڕەی خۆشم دەویست، ڕۆژێك لە کۆلیج داوەتی قاوەیەکی کردم. بریا ئەو قاوەیەم قەت نەخواردبایەوە."

منیش بەپەرۆشەوە پرسیم، "بۆچی؟"

کارلا هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و گوتی، "هەر دوای قاوەخواردنەوەکە چووینە ماڵی کوڕەکە و ئیتر سێکسمان کرد. دەزانی ئەوسا زۆر منداڵانە بووم و وەك ئێستە بیرم نەدەکردەوە."

بۆ ئەوەی بیکەم بەگاڵتە گوتم، "کارلا بچین قاوەیەك بخۆینەوە..."

هەردووکمان زۆر پێکەنین و دواتر چووینەوە ناو ئاپۆڕەی خەڵکەکە.

★★★

دوای ئاهەنگەکە کارلا منی گەیاندەوە ماڵ. دەوروبەری سەعات ١١ی شەو بوو. ئەو کوڕەی لەگەڵمدا بوو لە خانووەکە میوانێکی سعودی هەبوو. سعودیەکە ناوی تەهار بوو. تەهار خێرا باسی عێراقی کرد و دڵتەنگی خۆی پێشان دا لەهەمبەر ئەو بارە تەناهییە ناهەموارەی عێراق تێیکەوتووە.

دواتر من دەستم کرد بە قسە و بە عەرەبی پرسیم: چەند ساڵە لە ئەمەریکای؟

"٢ ساڵە."

"ڕات چییە لەسەر خەڵکی ئەمەریکا؟" من پرسیم.

تەهار یەکسەر گوتی "خەڵکی ئەمەریکا زۆر زۆر باشن کە قەت چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد."

مەبەستت چییە باشن؟

گوتی "دەزانی ئەمەریکاییەکان وەك موسڵمانان وان."

منیش پرسیم، "چۆن وەك موسڵمانان وان، مەبەستت چییە؟"

# ٥

# ئەمەریکاییەکان وەك موسلمانان وان

هاوڕێکەم عالیە خەڵکی ئیب بوو. ئیب پایەتەختی پارێزگەی (ئیب)ە لە یەمەن. من پێم دەگوت سەوزە چونکە شاری ئیب ناسراوە بە "شاری سەوز". ناسینی عالیە زۆر سەیر بوو. لە پشت کتێبخانەی ئۆنشوتز تەنیٚ دانیشتبوو دەگریا ئەو دەمەی بەوێدا چووم و چاوم پێی کەوت. منیش وەك پیشەیەکی کوردانە و مرۆڤدۆستانە چوومە لای.

"تۆ باشی؟" من بەنیگەرانییەوە پرسیم. "دەتوانم یارمەتیت بدەم."

عالیە وەڵامی نەدامەوە و گریانەکەی بە کوڵتر بوو. نەمویست زیاتر لەوە بێزاری بکەم، بەڵام دڵیشم نەهات بەجێی بێڵم. چووم لەسەر بەردێك لە بەرامبەری دانیشتم. تەماشام کرد تا لە گریانەکەی لەخۆ بووەوە. هێند گریا تا چاوی بەژان کەوت. بەو گریانەی ئەو، گریانەکەی خۆمم بیر کەوتەوە کاتیٚ لۆهان و کانیم بەجێهێش و فڕیم بۆ ئەمەریکا. لە هەولێر تا عەممان لە ناو باڵەفڕگە گریام، گریانێك نەرم وەك نمە باران.

دوای ئەوەی تێر گریا، بەپەلە کلینیکسێکی لە جانتاکەی دەرهێنا و چاوەکانی سڕیەوە. ئەوجا لێی دا ڕۆیشت بیٚ ئەوەی هیچ حسێبێك بۆ من بکات، یان بلیٚ سوپاس بۆ پرسینت. من هیچ بەرتەکێکم نەبوو بۆ ئەمە و زۆر لام ئاسایی بوو، چونکە لە سەروسیمایڕا زانیم ئەمەریکی نییە. لە سەرپۆشینەکەیڕا زانیم موسلمانە و خەڵکی وڵاتێکی عەرەبییە، بۆ وێنە میسر.

ڕۆژی دواتر دەمەو ئێوارە، بینیمەوە لە هەمان شوێن دانیشتووە دەگری. هەمان گریانەکەی دوێنیٚ، بەکوڵ. دیسان چوومەوە لای و پرسیم، "بۆچی دەگری؟". "دەتوانم یارمەتیت بدەم؟"

"برۆ وازم لێ بێنه، تۆ ناتوانی یارمەتیم بدەی،" بەدەنگێکی نەرم و لەسەرخۆ گوتی. "من قەت نەدەبوو بێمە ئەمەریکا. بەنەعلەت بی ئەو وڵاتە!"

"بۆ؟" حەزم لێ بوو بزانم بۆچی بەو شێوەیە رقی لە ئەمەریکایە. "خەڵکی کوێی، بیری ماڵەوە دەکەی؟"

هیچ وەڵامی نەدامەوە و منیش چووم لەسەر هەمان بەرد لە بەرامبەری دانیشتم. هیچم نەگووت و بەس تەماشام کرد. لەناکاو یەك بەخۆم پێی پێکەنیم و گوتم، "وەك منداڵان دانیشتووی لێرە، بەس دەگری. ئەوە کاری منداڵانە کاتێ لە دووی دایکیان دەگرین. بێگومان تۆ بۆ خوێندن هاتوویتە ئێرە، ئیتر پێویست ناکات کاتت بەگریان بەفیڕۆ بدەی. وا باشترە جەخت لەسەر خوێندنەکەت بکەیەوە، چونکە ئەو ماوەیەی تۆ لێرەی خێرا دەڕوا."

"خوێندنەکەم گرانە. بیری ماڵەوە دەکەم و حەزیشم لە ئەمەریکا نییە،" تەماشای کردم و گوتی. چاوەکانی هێشتا پڕ بوون لە فرمێسك کە جارجارە بە کلینیکس دەیسڕینەوە.

"من ناوم گۆرانە و خەڵکی عێراقم، ئەی تۆ؟" هەستام و چوومە لای.

"ناوم عالیەیە، خەڵکی یەمەنم." هەستا و چاوەکانی سڕیەوە.

ئیتر پێکەوە، بێ ئەوەی لە یەکتری بپرسین بچین بۆ کوێ یان بۆچی پێکەوە دەڕۆین، چووین بۆ کانزەس یونیەن. لەوێ چووم دوو قاوەم هێنا، یەکێکم لە پێش عالیە دانا و ئەوی تریش بۆ خۆم.

"پێم بڵێ بۆ حەزت لە ئەمەریکا نییە؟" تەماشای ناو چاوم کرد. "کەس ئازاری دای، یان کەس هەیە بێزارت بکات؟"

"نا." فڕێکی لە قاوەکەی دا و گوتی. "نەریت و هەڵسوکەوت و ژیانیان لەگەڵ هیی ئێمە ناگونجێ. من ناتوانم ئەو خوێندنە تەواو بکەم لێرە."

"هاوڕێیەکی سعودیم هەیە ناوی تەهارە،" بەهێواشی گوتم. "شەوێك پێی گوتم کەوا ئەمەریکاییەکان وەك موسلمانان وان. ئەو زۆر سەرسامە بەهەڵسوکەوتی ئەمەریکاییەکان و دەڵێ زۆر یارمەتیدەرن."

عالیە چاوەکانی زەق بوونەوە و نەیتوانی هیچ بڵێ کاتێ پێم گوت سعودییێك بەو شێوەیە باسی ئەمەریکییەکان دەکا. بۆ شاردنەوەی حەپەسانەکەی، فرێکی درێژی لە قاوەکەی دا. قاوەکە هێشتا زۆر گەرم بوو و دەمی سووتا. تووند دەمی گرت و چاوەکانی قەپات کردن و بەدەست ئاماژەی بەدەمی کرد بۆ من.

"دەزانی دەبێ تۆ یەکەم جار لە ئەمەریکاییەکان بگەیت،" زەردەخەنەیەکم کرد بۆ سووتانی دەمی و گوتم. "هۆکاری ئەوەی تۆ ژیانت لێرە بە زەحمەت کەوتووە ئەوەیە تۆ بە کۆمەڵێك بۆچوونی هەڵە لەسەر ئەمەریکاییەکان هاتوویتە ئێرە و ناتەوێ لێیان نێزیك ببیەوە و تێیان بگەیت. ئەمەریکاییەکان وا نین. ئێمە بەهەڵە لێیان تێگەیشتووین."

"ڕاست دەکەی!" بەپێکەنین و تۆزێك بەشانازییەوە گوتی. "ماوەی ساڵ و نیوێکە لێرەم، تا ئێستە هیچ برادەرێکی ئەمەریکاییم نییە. هەیە و نییە چەند برادەرێکی یەمەنیم دۆزیتەوە کە تەنێ لەگەڵ ئەوان هەڵسوکەوت دەکەم."

"ئەمەریکاییەکان کۆمەڵێك سیفەتیان هەیە دەبێ تۆ بیانزانی بۆ ئەوەی بەهەڵە لێیان تێنەگەی،" فرێکم لە قاوەکەم دا و گوتم. " خەڵکی ئەمەریکی سەربەخۆ پەروەردە کراون. تاکەکەسین، وەك لای خۆمان کۆمەڵایەتی نین. زۆر کار دەکەن و ئاگایان لە کەس نییە، بۆیە زۆرجار ساردوسڕ دێنە پێش چاو، بەڵام وا نین، هۆکارەکە ئەوەیە زۆر ماندوون و تاکەکەسین. هەر تاکێکی ئەمەریکایی بگری، ئەوحی کەسانی خۆی هەیە. ئەمە زۆرجار وای لێ دەکات سەرقاڵ بێت و شەو و ڕۆژ کار بکات بۆ هێنانەدی خەون و تموحەکانی."

عالیە بەدوودڵی قاوەکەی بۆ دەمی برد و فرێکی بە ئاستەم لێ دا و گوتی، "ئێ چی تر، زیاترم پێ بڵێ."

"ئەمەریکاییەکان زۆر پابەندن بەو شتانەی پێیانەوە بەندن، پابەندن بە کات. هەروەها شك لە هەموو شتێك دەکەن. بۆیە بەردەوام پێش دەکەون. ئێمە زۆر جار دەڵێین بەهاوڕێیەتی ئەمەریکایی باوەڕ مەکە، چونکە زۆر تەنکە و مایەی متمانە نین. بەڵام وا نییە. زۆرجار وا دێنەپێش چاو، چونکە زۆر ماندوون بەژیانی ڕۆژانەی خۆیانەوە. من زۆر ڕاستگۆییم لە ئەمەریکاییەکان بینیوە. لە گەڵ هەموو شتێکدا ڕاستگۆن."

"مەبەستی هاوڕێ سعودییەکەت چی بوو لەوەی ئەمەریکاییەکان وەك موسلمانان وان؟" عالیە بەم پرسیارە منی پچڕاند.

"ئێمەی موسلمان وا پێناسەی خۆمان دەکەین کەوا یارمەتی هەموو کەس دەدەین و هەرکاتێك یەکێك داوامان لێ بکات دەچین بەدەنگییەوە تەنانەت ئەگەر کاریشمان هەبێ. تەهاری هاوڕێم ئەوەی لە ئەمەریکاییەکان بینیوە. دەزانی منیش هەمان بۆچوونم هەیە. ئەگەر بتەوێ لە شەقام بپەڕیوە، یەکسەر شوفێرەکە بۆت ڕادەوەستێ. ڕاستە پیادە مافی ڕۆیشتنی هەیە، بەڵام خۆ دەتوانن یارمەتیت نەدەن. ئەو کاتەی گەیشتمە ئێرە ئێجگار زۆر یارمەتی منیان دا. ئێستەش هەر شتێکم بووێ و پرسیار لە ئەمەریکاییەکان بکەم زۆر یارمەتیم دەدەن."

عالیە حەپەسا بوو، وەك بڵێی قەت گوێی لە قسان نەبووە. بۆ ئەوەی زیاتر بیدوێنم، پرسیم، "کاتێ گەیشتییە ئەم زانکۆیە، زانکۆی کانزەس، کەس یارمەتی نەدای؟"

"نا کەس یارمەتی نەدام!"

"خۆت نەتویستووە کەس یارمەتیت بدات، یانیش ئەوەتا داوای یارمەتیت لە کەس نەکردووە،" گوتم. "بۆ ئەوەی لە ئەمەریکاییەکان بگەیت و ئەو بۆچوونانەی پێشتر هەتە لەسەریان لە بیریان بکەیت دەبێ تێکەڵاویان بیت. خەڵکی ئەمەریکی حەزیان لە دۆستایەتییە. لەوانەیە ئەوان نەزانن چۆن لەگەڵت بجوڵێنەوە چونکە شارەزای کولتووری تۆ نین. دەبێ تۆ خۆت دەسپێشخەری بکەیت و خۆتیان پێ بناسێنی."

"ڕاستە!" عالیە، وەك بڵێی دەمێك بوو دەیویست وا بڵێ، خێرا گوتی. "نازانم چۆن لەگەڵیان تێکەڵاو بم. نازانم؟"

"دەتوانی داوایان لێ بکەیت ئەگەر بۆنەیەکی ئەمەریکی هەبوو داوەتت بکەن،" فرێکم لە قاوەکەی بەردەمم دا و گوتم. "تەنیا لە رێگەی بەشداریکردن لە چالاکییەکانیان لە ژیانی رۆژانەیان دەتوانی ببیتە برادەریان و تێیان بگەیت. بۆ وێنە، برۆ ئاهەنگی لەدایکبوونیان، برۆ ئاهەنگی هالۆووین، برۆ نانیان لەگەڵ بخۆ، برۆ بەشداری سانکسگیڤینیگ بکە. برۆ دیسکۆ لەگەڵیان!"

"ئەوەی ئەخێریان نا، ناتوانم بچمە دیسکۆ،" بەنیوە تووڕەبوونێکەوە گوتی.

من بەئەنقەست گوتم دیکسۆ و بارِ. دەزانم موسلمانان، بەتایبەتی ئافرەتیان ناچنە بارِ و ناخۆنەوە. بۆ ئەوەی زیاتر گەمە بەهەستی بکەم گوتم، "لە راستیدا، زۆر ئافرەت هەیە موسلمانیشە بەڵام زۆر کراوەیە و دەچێتە بارِ لەگەڵ هاورێ ئەمەریکاییەکانی. ناخواتەوە بەڵام دەچێ!"

قاوەکانمان تەواو کرد و کاتی من تەواو بوو و دەبوایە برۆم. من و عالیە چووینە دەرەوە و لە پێش بەیلی هۆڵ راوەستاین و چاوەڕێی پاسمان کرد. من بۆ خەتی ٢٨ و ئەویش بۆ خەتی ١١ چاوەڕێمان وەستاین.

عالیە قوتابیی دکتۆرا بوو لە پەروەردە لە زانکۆی کانزەس، لە شاری لۆرێنس. زۆر بیری ماڵەوەی دەکرد و هیچ برادەری نەبوو. نەچوونە دەرەوە و نەبوونی برادەر زیاتر بێهێزیان کردبوو. کاتێ چاوەڕێی پاسمان دەکرد لە پڕ تەهار، هاورێ سعودیەکەم، دەرکەوت. بەپێکەنینەوە هاتە لای من و منیش بە عالیەم ناساند.

"تەهار بە عالیە بڵێ ئەمەریکاییەکان چۆنن،" بەپێکەنینەوە بە تەهارم گوت.

"ئەمەریکاییەکان وەك موسلمانان وان،" تەهار بەنگێکی نیوە بەرز بەعالیەی گوت. "بەڵام یەك شتیان خراپە ئەویش ئەوەیە نوێژ ناکەن، ئەگەر بێو نوێژەکە بکەن ئەوا دەچنە بەهەشت!"

هەرسێکمان پێکەنین بەوەی چۆن ئەمەریکاییەکان دەتوانن نوێژ بکەن. بەڵام بڕوای تەهار وابوو کەوا ئەمەریکاییەکان خەڵکی سادە و یارمەتیدەر و بەویژدانن، وەك

چۆن موسلمانی باش هەردەم یارمەتی خەڵك دەدا و بۆ مرۆڤایەتی دەژیت، تەهاریش ئاوا لە ئەمەریکاییەکانی دەڕوانی.

"منیش یەکەمجار بەهەڵە لە ئەمەریکاییەکان گەیشتبووم، بەڵام وانین باوەڕ بکە زۆرجار لە موسلمانان باشترن،" تەهار بەپەرۆشەوە وای گوت.

لەو قسانەدا بووین خەتی ٢٨ هات و هەردووکم، عالیە و تەهار، پێکەوە بەجێ هێشت. چوومە ناو پاس و لە تەنیشت ژاپۆنییەك دانیشتم. ئەوەی راستی بێ تا قسەمان نەکرد نەمزانی خەڵکی چینە. ئێمە لە کوردستانی عێراق ئەوەی خەڵکی لای رۆهەڵاتی دوور بێ، ئێمە هەر بە ژاپۆنی ناویان دەبەین، تەنانەت فیلمە چینییەکانیش هەر بە ژاپۆنی دەزانین.

"ناوم جانگۆیە،" دەستی هێنا بۆ تۆقەکردن و گوتی. "ئەی تۆ؟"

"گۆرانم، سوپاس."

"خەڵکی کوێی و چی دەخوێنی لێرە؟" جانگۆ پرسی.

"خەڵکی کوردستانی عێراقم و ماستەر لە بواری رۆژنامەوانی دەخوێنم."

"تەنێ دەژی ؟" وەك بلێی بەدوای یەکێکدا دەگەڕێ تا خانوێك بەیێکەوە بەکرێ بگرن و تێیدا بژین.

"نەخێر، لەگەڵ یەکێك دەژیم خەڵکی سەنیگاله، ئەفریکا،" بەسەرسامییەوە گوتم.

"ئەوەی لەگەڵم دەژی نای ئیبامایە و بۆچوونی تایبەتی لەسەر ئەمەریکا هەیە."

"مەبەستت چییە،" جانگۆ پرسی.

## ٦

# "ئەمەریکییەکانم خۆش دەوێ، بەڵام ڕقم لە ئەمەریکایە"

هێندەی نەمابوو بخنکێ. باڵەکانی شکا بوون و نەیدەتوانی بیانجوڵێنێ و مەلە بکات. قاچەکانی ڕەق بووبوون، دەتگوت لە زەنەك چەقیون. بێو لە ئێمە نێزیك نەبا و ئێمە هەستمان پێی نەکردبا، ئێستە ئاو و ئاو چوو بوو. من و زۆکای هاوڕێم بەپەلە گەیشتینە سەری و هێنامانە دەرەوە لە قەراخ دەریاکە. هەناسەبڕکێ و شەکەت، ماوەییێکی باش ئاو ڕشاوە. قاچەکانی گۆج بوو بوون، بۆیە یەکسەر قاچی ڕاستەیم گرت و بەرزم کردەوە و قیت ڕامگرت بۆ ئەوەی دەمارەکانی بێنەوە شوێنی خۆیان پێکانەکەی چاك بێتەوە. زۆکای هاوڕێم، کە بەڕەگەز ڕووسی بوو، لەسەر سەری وەستا بوو و جارجارە دەیگوت، "تۆ باشی، ئادلۆس؟" ئادلۆس خەڵکی سوریا بوو و وەك من فولبڕایتەر بوو. من و زۆکای هاوڕێم لە خنکان ڕزگارمان کرد لە دەریاچەی کلینتن، لە شاری لۆرێنس لە ویلایەتی کانزەس.

ئادلۆس و زۆکا دوای سێ هەفتە منیان بەجێ هێشت و چوونە ویلایەتی تر بۆ خوێندن. لە زانکۆی کانزەس بوون بۆ تەواوکردنی کۆرسی پێش دەستپێکردنی ئەکادیمیا. ئادلۆس دەیزانی من بەدوای یەکێکی باشدا دەگەڕێم بۆ ئەوەی لەگەڵی خانوویێك بەکرێ بگرین.

لە کاتی ماڵئاواییدا، ژمارەی تەلەفۆنێکی لە دەستی نام و گوتی تەلەفۆنی بۆ بکە. دەتوانی لەگەڵی بژی، مرۆییێکی زۆر باشە، ڕۆشنبیر، هێمن و بێ گرفت.

ڕۆژی دواتر ئیمەیلێکم لە ئادلۆسەوە پێگەیشت، ئەمە دەقی ئیمەیلەکەیە:

"سلاو گۆران،

دەزانی هەرگیز ئەو رۆژە لە بیر ناکەم کە منت زرگار کرد لە مردن. هەموو ژیانم قەرزداری تۆیە. ئەریٚ تەلەفۆنت بۆ ئیبراهیمە کرد؟ دەتوانی لەگەڵی بژی و متمانەی پیٚ بکەی. ئیبراهیمە خەڵکی سەنیگالە-ئەفەریقیا. مرۆییٚکە فریشتەئاسا. موسلمانیٚکی راستەقینەیە، راستەقینە واتە خوا دەناسیٚت و خەم بۆ مرۆڤایەتی دەخوا. دەیەویٚ هەموو دنیا ئارام و ئاشتەوەر بیٚ. نازناوی "ئیباما"یە. ئەگەر لیٚم بپرسی، بەڕاستی نازانم بۆچی پییٚ دەڵیٚن ئیباما.

با پیٚوەندیمان بەردەوام بیٚ،

ریٚز،

ئادلۆس."

دوای خویٚندنەوەی ئیمەیلەکە یەکسەر بیرم لەوە کردەوە ئاخۆ ئەو ژمارەی تەلەفۆنەم لە کویٚ داناوە. ماوەییٚك گەڕام تا دۆزیمەوە. ژمارەکەم لیٚ دا، کەس وەڵامی نەدایەوە. جاری دووەم لیٚم دایەوە، هەڵگیرا.

" ئەم کاتەت باش، من گۆرانم. بەڕیٚزتان ئیبراهیمن؟"

"بەڵیٚ،" دەنگیٚکی رادیۆ ئاسا وەڵامی دایەوە.

"من فولبرایتەرم لە زانکۆی کانزەس دەخویٚنم. بەدوای یەکیٚکدا دەگەڕیٚم خانوویٚکی لەگەڵ بگرم. من ئەم سیفەتانەم هەیە: رووخۆش، هیٚمن، رژد لە خویٚندن و بیٚ گرفت. ئەگەر پیٚت باش بیٚ ئەوا خانوویٚك پیٚکەوە دەگرین."

"زۆر باشە،" خیٚرا رازی بوو وەك بلیٚی ئەویش دەمیٚکە بەدوای مندا دەگەڕیٚ. "برۆ خانوو بگرە، من هەفتەیەکی تر دەگەمە کانزەس. ئیٚستە لە بەفەلۆم، نیو یۆرك."

خانوویٚکم بەکریٚ گرت. دوای هەفتەیەك ئیباما گەیشت و ئیتر پیٚکەوە ژیانمان بردە سەر. زۆرجار دادەنیشتین باسی زۆر شتمان دەکرد. من باسی کوردستان و عیٚراقم بۆ ئەو دەکرد، ئەویش باسی سەنیگال و وڵاتانی ئەفریکای بۆ دەکردم. لە ماوەی ئەو ساڵەی پیٚکەوە ژیاین، زۆر شت لە یەکترییەوە فیٚربووین. هەموو جار دەیگوت سەنیگال پیٚویستی بەگۆڕانە، دەبیٚ ئەو وڵاتە بگۆڕیٚ. منیش هەموو جار پیٚم دەگوت

کوردستان پێویستی بەگۆڕانە و دەبێ بێتە گۆڕین. باسی فەلسەفە، سیاسەت، کۆمەڵایەتی، ئابووری و ئایین، روح، جن، خوا و هەموو شتێکمان دەکرد. ئەویش وەك من فولبڕایتەر بوو و لە زمانەوانی بۆ ماستەر و دکتۆرا هاتبوو.

رۆژێك لە زانکۆ هاتمەوە، ئیباما "مافێ"ی لێ دەنا. مافێ خواردنێکی سەنیگالییە بە گۆشتی سوور ئامادە دەکرێ. دوای سەعاتێك نانی نیوەڕۆ ئامادە بوو.

"رات چییە بەرامبەر بە ئەمەریکاییەکان؟" من پرسیم دوای یەکەم کەوچکم لە مافێ کە تامی ئێجگار خۆش بوو. "بەخوا بەلەزەتە!"

"بەرامبەر بە ئەمەریکاییەکان، یان ئەمەریکا؟" ئیباما پرسی، " کامیان، چونکە دوو شتی لە یەکتر جیان!"

"ئەمەریکاییەکان."

هەستا سەر پێ، چووە لای بەفرگرەکە(سەلاجە) و دوو گلاس شەربەتی پرتەقالی هێنا، یەك بۆ خۆی و یەکیش بۆ من. قومێکی لە شەربەتەکەدا و چەند چرکەیەك لە دەرەوە راما.

"من بەڕاستی زگم بەئەمەریکاییەکان دەسووتێ!" هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی. دواتر دەستی کرد بەخواردنی مافێ و برنج. "زۆرجار بیر لە ژیانی ئەو ئەمەریکاییانە دەکەمەوە، دەگەمە ئەو باوەڕەی ئەو گەلە داماوە ژیانیان نییە،" کەمێك وەستا تا پاروەکەی قووت دا. "زۆرجار پێدەکەنم بەبیری خەڵکی سەنیگال کە پێیان وایە ئەمەریکاییەکان زۆر دەوڵەمەندن. ژیانی سەنیگالییەکان زۆر خۆشترە لە ژیانی ئەمەریکاییەکان."

"رەنگە تەنێ خزمەتگوزارییەکان جودا بن، لەوێ کەموکورتی خزمەتگوزاری هەیە، بەڵام لێرە ئاو، کارەبا، ئینتەرنێت، هەموو پێداویستییێکی بنەڕەتی ژیان دابین کراوە،" من لە قسان پچڕیم و گوتم.

"هاوڕێ شتێکی تریش جیاوازە،" سەری لەسەر خواردن بڵند کرد و گوتی. "بەڕاستی لێرە یاسا کار دەکات، یاسا لەسەرووی هەموو شتێکەوەیە."

ملاکێکی تری خوارد و ئەوجا لە مێزەکە کشایەوە. قاچەکانی خستنە سەر یەکتری و روانییە دەرەوە.

"زگم بەئەمەریکاییەکان دەسووتێ، چونکە رۆژانە زۆر کار دەکەن تەنێ بۆ ئەوەی سەرە مانگان پارەی کرێی خانوو، خزمەتگوزارییەکان دەربێنن، " بەردەوام بوو لە قسەکردن. "ئەمەریکایی ناژین، بەس ئیش دەکەن. هەموو ژیانیان برێتییە لە دوو رۆژی هەفتە کە ئەویش بەخواردنەوە بەسەر دەبەن لە بارەکان. زۆرجار دەبینم ئافرەتێك یان پیاوێك بەتەنێ دەژیت. بێ منداڵ، بێ کەسوکار لە یەك ئاپارتماندا دەژی. ژیانی بەتەنێ وەك گرتیگەی تاکەکەسی وایە. زۆر لە خۆم دەپرسم، کاتێ پیر دەبن، چی دەکەن، چۆن هەروا بەتەنێ دەژین، کێ خزمەتیان دەکا."

چووم تۆزێکی ترم لە مافێ و برنج هێنا و لە شوێنی خۆم دانیشتمەوە. ئیباماش هات دانیشتەوە و قومێك شەربەتی خواردەوە.

"من بەڕاستی ئەمەریکاییەکانم خۆش دەوێ،" لەناکاو گوتی. "خەڵکی باشن، زۆر یامەتیدەرن. پرۆفیسۆرێکم هەبوو لە بەفەلۆ زۆر یارمەتیی دام. قەت نەمدەزانی ئەمەریکاییی ئاوان."

"ئەی رات لەسەر ئەمەریکا چۆنە؟"

"من رقم لە ئەمەریکایە،" ئیباما لەسەرخۆ گوتی. "مەبەستم لە ئەمەریکا وڵاتەکە نییە، وڵاتێکی جوان و خۆشە، بگرە مەبەستم سیستمی ئەمەریکایە، ئەو سیستمەی خەڵکی پێ بەڕێوە دەبەن."

"مەبەستت سەرمایەدارییە؟" پرسیم.

"بەڵێ، ئەو سیستمە وای لە خەڵکەکە کردووە زۆر سەرقاڵ بێ و ئاگای لە هیچ نەبێ،" ئیباما بەتاسەوە گوتی. "خەڵك لێرە دنیاییێکی بچووکی هەیە، لە ماڵەوە بۆ ئیش، لەوێش بۆ ماڵ، هەفتەی جارێ یان دوو جار بۆ شت کڕین و رۆژانی شەمە و یەکشەمیش بارِ و خواردنەوە. بەدەر لەو دنیایە هیچی تر نازانێ."

"ئەی لە هەموو شوێنێك هەر وا نییە؟" پرسیم.

"هیچ شوێنێك وەك ئەمەریكا نییە، خەڵك لێرە زۆر ماندووە و هیچ ژیانی نییە، بۆیە وەها دەكەی یەك خۆی دەكوژی،" ئەو گوتی. "دەزانی تەماشای هەندێ دۆكیومێنتەریم كرد كە چۆن سیستمی ئەمەریكا گەلی ئەمەریكا و سیاسەت بەڕێوە دەبا."

قاپەكانم هەڵگرتەوە و شووشتم. شەربەتەكەم تەواو كرد و لەسەر كورسییەكە دانیشتمەوە.

"باشە بۆ پێت دەڵێن ئیباما،" من بەپێكەنینەوە پرسیم.

"چونكە بە ئۆباما دەچم."

هەردووكمان پێكەنین و هەریەكە چووینەوە ژووری خۆمان.

من لە ژوورەكەی خۆم تەماشای ئیمەیلەكانم كرد و دواتر خۆم گۆڕی و چوومە دەرەوە. لە ڕێگەمدا بەرەو زانكۆ دەچووم چاوم كەوت بە هاوڕێ فەلەستینییەكەم. كاتی خۆی لە كۆرسی پێش ئەكادیمیا یەكترمان ناسی. ئەویش وەك خۆم فولبڕایتەر بوو.

"هەلاو، كاك گۆران چۆنی؟" بەپێكەنینەوە تۆقەی لەگەڵ كردم و لێمی پرسی.

"باشم، تۆ چۆنی؟"

"زۆر باشم، سوپاس بۆ خوا."

"لە ئەمەریكا مورتاحی، ئێرە خۆشترە یان فەلەستین؟" من بە گاڵتەجاڕییەوە پرسیم.

"ئەمەریكا بەهەشتە، من لەو دنیا ناچمە بەهەشت چونكە بەهەشتم دیت،" ئەو بەپێكەنینەوە گوتی.

"چۆن؟"

## ٧

# "نەعلەت لە ئەمەریکا، نەعلەت لە ریش"

راپەڕی لە خەو و دەستی بەگریان کرد. سەعات سێ و نیوی بەیانی بوو، یەك بەخۆی دەگریا. باسی دوو براکەی دەکرد. بەعەرەبی قسەی دەکرد، بەڵام هەندێ جار وشەی ئینگلیزیشی تێدەخست. نەعلەتی لە ریش دەکرد. لەپڕ دەستی دایە ئەو مقەسەی لەسەر مێزەکە دانرا بوو، ویستی هەموو دەموچاوی شەق شەق بکات. منیش بەگریانی ئەو لەخەو هەستام و خێرا چوومە لای و مقەسەکەم لە دەست دەرهێنا نەبادا زیانێك بەخۆی بگەیەنێ. دوای خۆپچڕان و چیڕکردنەوەی، هەوڵی دا مقەسەکەم لێ وەرگرێتەوە، بەڵام من بەهەموو هێزوو تینی خۆم نەمهێشت. رەفتاری شێتانە بوو، بۆیە من ترسام نەبادا شتێك لە خۆی یان لە من بکات. مقەسەکەم لە گیرفانی خۆم خست و دەستم لە ملی کرد. ئەویش توووند باوەشی لێ دام و گریانەکەی بەکوولتر بوو.

"نەعلەت لە ئەمەریکا، نەعلەت لە ریش،" بەگریانەوە وای گوت!

لەسەر پێخەفەکەی دامنیشاند و تۆزێك ئاو لە بنی بوتڵە ئاوێکی دوێنێ مابوو، دامێ و بەئاستەم خواردییەوە. هەنسك و داد و فیغانێکی بوو نەبێتەوە. جارجارە بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد و جارجاریش منگەمنگی لێوە دەهات.

"تکایە ئارام بە، هەموو شتێك باش دەبێ،" من دڵم دایەوە بێ ئەوەی لێی بپرسم چی رووی داوە.

دواتر هەستا چووە لای دیوارەکە و کەمێك وەستا، ئەوجا دەستی کرد بەکەللە لێدان لە دیوارەکە. ئەگەر بێو بەتەنێ با، هەر ئەو شەوە بەسام کەللەی خۆی دەتەقاند. دیسان چوومە لای و خێرا لە دیوارەکەم دوور خستەوە و توووند باوەشم لێ دا.

"تکایە بوەستە،" لێی پاڕامەوە. "چی تر وا مەکە، هەموو شتێك باش دەبێ."

دەستی کرد بەگریانێك تا ئێستە گریانی ئاوا بەکوڵم نەدیتبوو. بەسام خەڵکی فەلەستینە و وەك من فولبرایتەر بوو. هاتبوو و لە زانکۆی هارڤارد وەرگیرا بوو بۆ زانستی کۆمپیوتەر. بەلام بۆ کۆرسی پێش ئەکادیمیا رەوانەی زانکۆی کانزەسیان کرد بوو. بەسام و منیان لە ژوورێك دانا لە هۆلی هاشینگەر لە ناو زانکۆکە. هەردوو فولبرایتەرێك لە ژوورێکدا بوون لە هاشینگەر.

"نەعلەت لە ریش، نەعلەت ئەمەریکا،" ئەم رستەی دیسان بە دەنگێکی بەرز و بەگریانەوە دووبارە کردەوە.

شەقێکی هێواشم لە روومەتی دا بۆ ئەوەی بێتەوە سەرە خۆی، چونکە وەك شێتان رەفتاری دەکرد.

"بەسە وا مەکە،" من لەسەریم هاوار کرد و لێی تووڕە بووم.

دەستی بەگریان کرد و توووند لە باوەشی گرتم و گوتی، "ببوورە هاورێ، بەلام ئەوانە تەنێ لەسەر ریش دوو برای منیان گرت و بەتیرۆریست لە قەلەمیان دان لە لبنان."

"مەبەستت چییە لەسەر ریش؟" پرسیم.

"لە لبنان کاریان دەکرد لە نانەواخانەیەك، رۆژێك هەردووکیان گرتن،" بەهێمنی وای گوت. "دواتر هەواڵیان پێدایەوە کەوا گیراون بە تۆمەتی تیرۆر لە لایەن کاربەدەستانی ئەمەریکا."

دانانی ریش لە ناو موسلمانان شتێکی باوە. هەندێ بۆ جوانی، هەندێ وەك سوننەتی پێغەمبەر دایدەنێن و هەندێکیش بۆ شاردنەوەی درز و برینی دەموچاو دەیهێڵنەوە. پێش سەرهەلدانی تیرۆریزم، کەسانی بە ریش و سمێڵ گرفتێکی وایان بۆ دروست نەدەبوو لە رۆژئاوا و نەدەبوونە جێی گومانی دەزگەیلی تەناهی. بەلام دوای پەیدابوونی تیرۆر، لەبەرئەوەش کە تیرۆریستان هەردەم ریشی درێژیان هەیە، ئیتر ریش بووەتە ناسنامەی تیرۆر. ریش بووەتە ئامێرێك بۆ ناشیرینکردنی ئیسلام. بۆچوونی رۆژئاوا، بەتایبەتی ئەمەریکاییەکان، لەسەر ئەوانەی ریشیان هەیە باش نییە،

بەتایبەتی ئەگەر ریشدار خەڵکی رۆهەڵاتی ناوەڕاست بێ. ئەمە هەڵەیەکی ئێجگار گەورەیە کە ئەمەریکاییەکان حوکم بدەن لەسەر رۆژهەڵاتییەکان لە رێگەی ریشەوە چونکە گەنج هەیە هەر بۆ جوانی ریش دادەنێ و لەوانەشە ئەوەندە پابەندیش نەبێ بە ئیسلامەوە. لێرەدا ئەمەریکاییەکان بە هەڵە لە کەسانی ریشدار تێگەیشتوون، ئەمەش دەرهاویشتەیەکی تیرۆریزمە کە دوو گەل دەکا بە دوژمنی یەکتر. هەموو ریشدارێك تیرۆریست نییە، مەرجیش نییە هەموو بێ ریشێك تیرۆریست نەبن.

ئەم شەوە شەوێکی زۆر ناخۆش بوو. ئەو چوار هەفتەیەی لەگەڵم بوو، جارجارە بەسام شەوان هەڵدەستایەوە و منگەمنگی دەکرد، یان دەگریا. ئیتر لەگەڵی راهاتبووم. کە ئەو رۆژە یەکترمان بینییەوە، بەسەردان هاتبووەوە زانکۆی کانزەس.

"چۆنە لێرەی؟" من پرسیم.

"وەڵا بەسەردان گەڕاومەتەوە ئێرە، چونکە بەڕاستی بیری زانکۆی کانزەس و هۆڵی هاشینگەر و مس ئیز دەکەم،" بەدڵخۆشییەوە گوتی.

دواتر من داوەتی قاوەیەکم کرد لە کانزەس یونیەن. لەوێ بۆ ماوەی سەعاتێك دانیشتین. هەموو ئەو شەوانەم بەبیر هێنایەوە کە لە خەو رادەپەڕی و منی دەترساند و تا بەیانی کڕ نەدەبووەوە.

"ئێستاش نەعلەت لە ئەمەریکا دەکەی؟" من بەپێکەنینەوە لێم پرسی.

"نا!" بەجدی گوتی. "ئەوساکە تازە هاتبوومە ئێرە و زۆر بیری ماڵەوەم دەکرد. راستە ئەمەریکا دوو برای منی بەهەڵە گرت، بەڵام دواتر هەردووکیانی ئازاد کرد و داوای لێبوردنیان کرد."

"هەموو ئەوانەی دێنە ئەمەریکا، یەکەم جار تووشی شۆك دەبن، چونکە بە کۆمەڵێك بۆچوونی هەڵەوە دێنە ئەمەریکا،" من وام گوت.

هەریەکە فڕی لە قاوەی خۆی دا و تەماشای یەکترمان کرد و پێکەنین. ئەو پێکەنینە واتە هەموو ئەو ساتانەی پێکەوە بەسەرمان بردبوو کە پڕ بوون لە گاڵتە و خۆشی و ناخۆشی.

"باشە راستم پێم بڵێ ، ئەمەریکا خۆشترە یان فەلەستین،" دووبارە پرسیارەکەم لێ کردەوە بۆ ئەوەی بزانم دووبارە دەڵێ چی.

"وابزانم من لە رۆژی قیامەت ناچمە بەهەشت،" بە زەردەخەنەییێکەوە گوتی.

"بۆ؟" پرسیم و پێکەنیم.

"چونکە خوا بەهەشتی سەر دنیای بەخشی بە من. ئەوەتا لە بەهەشتم ئێستا."

"ئەی فەڵەستین؟" من پرسیم.

"کاکە فەڵەستین وێران بووە،" بە خەمگینی گوتی. "هیچ ژێرخانی لێ نەماوە، کارەبا، ئاو، خۆراك نییە. پێداویستییە بنەڕەتییەکان ژیانی لێ نییە."

"باشە بە ڕای تۆ چارەسەر چییە بۆ ئەو رەوشەی فەڵەستین؟" پرسیم.

پشتی بەکورسیەکە دادا و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی، "پرسی فەڵەستین و ئیسرائیل تەنێ بە ئەمەریکا چارەسەر دەبێ. فەڵەستینییەکان چارەسەریان دەوێ و لەو مەرگەساتەی ئێستا تێیدا دەژین بێزار بوونە. بۆ ئەوان هەموو رۆژێك مردنێکە."

"تا چەند دڵت بە حەماس و دەسەڵاتی فەڵەستینی خۆشە ئامادە بن بۆ چارەسەرکردنی پرسەکە؟" پرسیم، وەك بڵێی دیمانەیەکی رۆژنامەوانی بێ ئاوا پرسیارم دەکرد.

بەسام فرێکی لە قاوەکەی بەردەمی دا، سەری بادا و قاچی راستی خستە سەر قاچی چەپی و موسەیتر دانیشت.

"حەماسی چی و فەتحی چی، ئەوە تۆ باسی چی دەکەی. دەزانی هەر ئەوانە تۆوی رك و کینە دەچێنن لە بەینی گەلانی رۆهەڵات و رۆژئاوا. فەڵەستینی لەوانە بێزارن، بەڵام گۆڕان زەحمەتە. خەڵکەکە هەژار و داماو و سەرلێشێواوە. هەر کاتێك هەردوو لا نێزیك ببنەوە لە چارەسەر، حەماس موشەکێك ئاراستەی ئیسرائیل دەکا بۆ ئەوەی هەوڵەکە نەزۆك بکات. خەمی ئەوانە بەس دەسەڵاتە و قەت خەمی هاوڵاتیی هەژاریان نییە. کێ دەکوژرێ، ئەوەی دەکوژرێ هەر مەدەنیی بێ تاوانە."

"ئەی بۆ خەڵك راناپەڕێن لە دژیان و شتێك بگۆڕن؟" من پرسیم.

"خەڵك مێشكی شۆردراوە، نازانن چی بكەن و زۆریش بێزارن،" بەسام وای گوت. "بۆیە پێویستییان بە هاوكاریی وڵاتێكی وەك ئەمەریكا هەیە."

"ئەگەر ئەمەریكا نەیویست ئەوە بكا؟" پرسیم.

كاتێ وام گوت دەمی بوو بە تەڵەی تەقیو. دەتگوت ئەوە دواهەمین پلانی ئەو بوو، دواهەمین چارەسەرێك كە بە بیری ئەو داهاتبوو. بۆیە كەمێك وەستا و سەری خوراند و فرێكی لە قاوەكەی دا.

"راست دەكەی، جاری وا هەیە ئەمەریكا خۆی نایەوێ پرسەكان لە رۆهەڵاتی ناوەڕاست چارەسەر بن،" بەگومانەوە وای گوت. ئیتر ئەوە سیاسەتە، هەر كەس بۆ خۆی هەوڵ دەدا، تەنانەت ئەگەر ئەمەریكاش پرسەكە چارەسەر بكات، بەجۆرێك دەیكات كە لە بەرژەوەندیی ئەودا بێ."

"چارەسەری فەڵەستین لە ناوەخۆیاندایە،" من وام گوت. "ئێوە خۆتان دەبێ رێژیمی خۆتان بگۆڕن و یەكێك هەڵبژێرن كە بۆ فەڵەستین و فەڵەستینییەكان كار بكات نەك بۆ دەسەڵات و كارنامەی وڵاتانی دراوسێ."

"راستە بەڵام ئێمە هەر چاومان لە ئەمەریكایە شتێكمان بۆ بكات."

هەردووكمان تەواوبووین لە قاوە خواردنەوە و لە كانزەس یونیەن یەكترمان بەجێ هێشت. ئەو چوو سەر لە هاورێكانی تری بدات، منیش بەرەو كتێبخانەی واتسۆن چووم.

لە رێگەدا، گەنجێكم بینی دەستی پیرەژنێكی گرت بوو و رێی پیشان دەدا. پیرەژنەكە كوێر بوو. بەو دیمەنە ئەوەم بەبیردا هاتەوە كە چۆن ئەمەریكاییەكان روحی یارمەتییان تێدایە. هەموو دەم ئامادەن یارمەتی ئەوانی تر بدەن. بیرم لەوە دەكردەوە كە ئەمەریكاییەكان چۆن بوونەتە قوربانی دەستی سیستم و سیاسەتی وڵاتەكەیان. بەدەم رێوە كارلای هاورێم دیت.

"چۆنی گۆران، وەزعت كوە؟" كارلا بە دەنگێكی زیندوو و ناسك پرسی.

"باشم، تۆ چۆنی؟"

"زۆر باشم، بەڵام زۆر ماندووم لەم سێمستەرە." کارلا گوتی. "کاتت هەیە ئێستا، دەتوانی یارمەتیم بدەی لە شتێك؟"

"بەرەو واتسۆن دەچووم، بەڵام بڵێ دەتوانم یارمەتیت بدەم چونکە وانەم نییە ئەمڕۆ."

"دەمەوێ بیر بکەمەوە لە پاشەڕۆژم،" کارلا گوتی. "ئەو شتانەی بڕیاریان لەسەر دەدەم، دەمەوێ یەکێکم لەگەڵدا بێ و قسەی بۆ بکەم و قسەم بۆ بکا. ڕەنگە تۆ بتوانی ئامۆژگاریم بکەیت."

"بێگومان."

"با بچین لەو دیو کانزەس یونیەن دانیشین،" پێشنیازی کرد.

پێکەوە چووین لەودیوی کانزەس یونیەن بەرامبەر مۆزەخانەی سپێنسەر لەسەر مێزێك دانیشتین.

"زۆر سوپاس کە کاتت بۆ من تەرخان دەکەی،" کارلا وای گوت.

"سوپاسی من مەکە، سوپاسی جێری بکە."

"جێری کێیە؟" کارلا پرسی.

# ٨

# ٢٥ سەنت

پاسەکە، کە بەرەو لاسڤێگاس دەچوو، لە دێنڤەر ماوەی بیست خولەك وەستا بۆ پشوو. هاتمە خوارێ و چووم کێکێکم کڕی و لە دەرەوە خواردم. کێکەکەم تەواو نەکرد بوو کاتێ کچێکی باریکەبەژنی تەنکی جوانم بینی لە بەرامبەرم لە دووری سەت مەترێکەوە وەك بی ناو ئاو لە سەرما دەلەرزی. چاوم لەسەری هەڵنەگرت. وامزانی یەکێکە لە نەفەرەکانی ناو پاسەکە. کە بینی من تەماشای دەکەم، وردە وردە لێم نێزیك بووەوە. هاتە بەر دەمم و هیچی نەگوت جگە لە تەماشاکردنم. منیش لێی ورد بوومەوە. ڕەنگی سیس بووبوو وەك بلێی حەفتەیەکە نانی نەخوارد بێ. لەپڕ بە دەنگێکی سیس و کز داوای بیست و پێنج سەنتی لێ کردم. منیش وامزانی گاڵتە دەکا، بۆیە وەڵامم نەدایەوە. چونکە ئەو پارەیە نەك لە ئەمەریکا لە هیچ کونجێکی دنیا بەشی ژەمێك نانخواردن ناکا.

"بێست و پێنج سەنتت پێیە؟" دووبارە داوای کردەوە.

"بیست و پێنج سەنتت بۆ چییە؟" من بەگومانەوە لێم پرسی، چونکە تا ئەوساکەش هەر وامدەزانی گاڵتە دەکا.

"برسیمە، دەچم کێکێکی پێ دەکڕم!"

کە وای گوت مووچڕکێك بەهەموو لەشمدا گەڕا و واقم وڕما. هێندەی نەما لە حەژمەتا چۆك دادەم و درێژ بم لەسەر زەوی. یەکسەر بیرم بۆ ئەوە چوو، چۆن کچێکی ئاوا جوان و ڕێك و پێك بێ پارە کەوتووەتەوە لە ئەمەریکا. دەزانم ئەمەریکا بێ ماڵ و بێ پارەی زۆرە، بەڵام کچێك وا نا کە ئەگەر دەرهێنەر بوومایە بەردەوام

هەڵمدەبژارد بۆ پاڵەوانی فیلمەکانم، چونکە ڕوویێکی زۆر هونەری و جوان و سەرنجڕاکێشی هەبوو. تووند دەستی ڕاستەم گرت و بەغار چووینە ناو دوکانەکە.

"هەرچی دەتەوێ هەڵگرە، من پارەکەی دەدەم." لە بن گوێی چەپی چرپاندم.

باوەڕی نەکرد. وایزانی خەونە. دڵنیام کردەوە کاتێ سێ جۆرە کێکم لە ڕەفەکانی دوکانەکە هەڵگرت و لە ناو دەستم نا. ئەوجا باوەڕی کرد و دوو دانە کێکی تریشی هەڵگرت. دوای ئەوەی هاتینە دەرەوە، پاسەکە لەسەر من وەستا بوو. شۆفێرەکە بە دەست ئاماژکەیەکی بۆ کردم تا بەخۆ کەوم و بچم. پەنجا دۆلارم دەرهێنا لە جزدانەکەم و دام بەکچەکە و پێم گوت لە هیچ شوێنێ باسی مەکە و تەنێ یارمەتی هاوڕێکەت بدە ئەگەر پێت کرا.

★★★

کارلا لەگەڵ ئەم چیرۆکە مەست بوبوو. پلانی داهاتووی خۆی لە بیر کردبوو.

یارمەتی ئەو کچۆڵەم دا لەبەر دوو هۆکار،" بە کارلام گوت. "یەکەم، لەبەر خوا هەردەم داوامان لێ دەکا یارمەتی هەژاران بدەین ئەگەر پێمان کرا. دووەم، لەبەر جێری، چونکە زۆر یارمەتی منی دا لە ئەمەریکا."

"واو!"

"جێری ژیانی منی زۆر ئاسان کرد لە ئەمەریکا،" بەردەوام بووم. "شوێنی دایکمی بۆ من گرتبووەوە. وەك دایك بۆ کوڕەکەی ئاوا خەمی منی بوو. نەك هەر من بگرە بۆ ئیبامای هاوژووریشم."

کارلا دەفتەرێکی بچووکی دەرهێنا و هەندێ تێبینی لەسەر نووسی. من وامزانی بێ تاقەت بووە و بۆیە چوومەوە سەر پلانەکانی ئەو.

"باشە پێم بڵێ بزانم پلانەکانت چین،" بابەتەکەم وەرگێڕا.

"نا، زیاتر باسی جێریم بۆ بکە،" کارلا پێی داگرت. "من لەو چیرۆکانە وانە وەردەگرم."

دڵم زۆر خۆش بوو کە وای گوت. دەمێك بوو حەزم دەکرد یەکێ هەبێ باسی جێری بۆ بکەم. کارلا کچێکی ئەقڵانی و زیرەك بوو، زۆرجار پێمی دەگوت کە ئەو لەسەربردەی خەڵك شت فێر دەبێ. نەمدەزانی باسی کامە رۆژی بۆ بکەم کە جێری یارمەتی دابووین.

"جێری و سوزانم لە کۆرسی پێش ئەکادیمیا ناسی،" گوتم. "دواتر بوومە دراوسێی هەردووکیان. هەستم دەکرد لە عێراق دەژیم، چونکە وەك دوو دراوسێ بۆ من و هاوڕێکەم زۆر باش بوون. عادەتی کوردانە کە یەکێکی نوێ دێتە گەڕەك ئەوانی تر یارمەتی دەدەن، هەر هیچ نەبێ شەوێك بەسەریدا دەدەن و بەخێرهاتنی دەکەن."

"هممم. . ." کارلا نمەی لێوە هات.

"جێری و سوزان زۆر یارمەتی منیان دا بەڕاستی لە کولتووری ئەمەریکی بگەم،" بەردەوام بووم. "منیش کولتووری کوردی و رۆهەڵاتی ناوەڕاست و ئیسلامیم بۆ شیدەکردنەوە."

"شانست هەبووە بووی بە دراوسێی ئەوانە،" کارلا گوتی.

"بەڵێ! جێری فێری چەندان شێوی ئەمەریکی کردم وەك: کەری چیکن، چیلی، پاستا، پەتاتەی مەشڕووم. پێش ئەوەی فێرم بکات، یەکەم جاری خۆی بۆی لێ دەناین و بۆ ئێوارە داوەتی دەکردین. لەگەڵ لێنان من و هاوژوورەکەم ئامادە دەبووین و فێری دەکردین."

"گوتت لەبەر جێری یارمەتی ئەو کچەت دا لە دێنڤەر، بۆچی؟" کارلا پرسی.

کزە بایەکی هات و ئەو کاغەزانەی لەبەردەمی من و ئەودا بوون هەڵفڕین. هەردووکمان بەدوای کاغەزەکان کەوتین و دوای ماوەیەك گرتماننەوە و هاتینەوە شوێنی خۆمان. بۆ ئەوەی چی تر کاغەزەکان نەفڕنەوە، کارلا لە ژێر کتێبێکی نان.

"جێری لە هەموو شتێك بەکەلکم هات، هەستم دەکرد نەمدەزانی چۆن چاکەی بدەمەوە." بەردەوام بووم. "رۆژێك پێی گوتم نازانم چۆن چاکەی بدەمەوە. ئەویش لە وەڵامدا گوتی پێویست ناکات چاکەم بدەیەوە بەڵام تۆ دەتوانی یارمەتی یەکێکی تر بدەی. هەروەها فیلمی "pAY IT fORWARD"ی دامێ رۆژێك تا تەماشای بکەم بۆ ئەوەی لە بیرۆکەکەی ئەو تێبگەم. نەك یارمەتی ئەو کچە، تا پێم بکرێ

یارمەتی خەڵك دەدەم و پێیان دەڵێم ئەوانیش یارمەتی ئەوانی تر بدەن، بەم شێوەیە کێشە لە دنیا کەم دەبێتەوە."

"بیرۆکەیەکی زۆر جوانە،" کارلا بە هێمنی گوتی. "خۆزگە ئەمە لە بەینی گەلانیش هەبوایە. ئەگەر وڵاتانی دنیا یارمەتی یەکتر بدەن و لەسەر ئەم بیرۆکەیە برۆن ئەوا کێشەگەلی دنیا چارەسەر دەبن. من لەلایەنی خۆمەوە وا دەکەم. لە راستیدا گەلێ خەڵك یارمەتی منیان داوە و منیش یارمەتی گەلێ کەسم داوە. بەڵام لەمەو پاش پێیان دەڵێم هیچم بۆ نەکەن بەس یارمەتی کەسانی تر بدەن."

"زۆر چاکە، با بێینەوە سەر داهاتووی تۆ." من گوتم.

"باشە،" کارلا بە پەرۆشەوە گوتی. "من دوو مانگی تر ماستەرەکەم تەواو دەکەم لە بواری رۆژنامەوانی.."

"دەتەوێ دوای تەواوبوون چی بکەیت،" من پرسیم.

"دوو شتم لە پێشە،" کارلا بەپەرۆشەوە گوتی. "زەواج و کار."

سەرم سڕما کاتێ گوێم لە کارلا بوو باسی زەواجی کرد. زۆربەی ئەمەریکایی زیاتر بیر لە کار دەکاتەوە پێش ئەوەی خوێندن تەواو بکات ئەوجا زەواج. بەڵام کارلا یەکەم جار باسی زەواجی کرد.

"بۆیفرێندە کۆنەکەتە؟" من پرسیم. "گەڕایەوە لات؟"

"نا، یەکێکی ترە!" کارلا بە خەمگینی گوتی. "کوڕێکە داوای لێکردووم شووی پێ بکەم دوای ئەو دوو مانگە. تۆ هاوڕێیەکی دڵسۆزی و متمانەت پێ دەکەم. هاوکات دیمانەی کارێکم کرد دوو مانگ بەر لە ئێستا و دوو رۆژ لەمەوبەر پێمیان گوت وەرگیرامە لە کارەکە. کارەکە لە کانزەس سیتیە."

"پیرۆزە، مێرد و کار پێکەوە بۆت هاتووە." من بە پێکەنیەوە گوتم. "دەبێ سوپاسی خوا بکەی، ئەمە شتێکی زۆر باشە. ئەی باشە گرفتت چییە؟

کارلا هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی و دوای چرکەیەك هەمووی بەجارێ هێنایەوە. چاوەکانی دوو سێ جار لێکنان و تەماشای کتێبەکەی بەردەمی کرد کە کۆمەڵێك

کاغەزی لە بن بوو. دواتر چاوەکانی هەڵبڕین و تەماشای دووری کرد. من لەو تەماشاکردنەڕا زانیم و زۆر بیر لە داهاتووی دەکاتەوە.

"کوڕەکە خەڵکی ئۆرلاندۆیە، فلۆریدا،" کارلا بە دەنگێکی نزم و سارد وای گوت. "داوای لێکردووم کە لەگەڵی بچمە ئەوێ. هێشتا پێم نەگوتوە کە لە کارەکەی کانزەس سیتی وەرگیراوم."

"ناتەوێ هیچیان لە دەست بدەی، وانییە؟" من پرسیم.

"بەڵێ، کوڕەکە زۆر منی خۆش دەوێ و زۆر ڕێزم لێ دەگرێ و زۆریش هێمن و ڕۆشنبیرە. من سیفەتەکانیم زۆر بەدڵە."

"ئەویش لەگەڵ تۆ تەخەروج دەکا،" پرسیم.

"بەڵێ."

"کاری دۆزیوەتەوە؟" پرسیم.

"بەڵێ کارەکەی ئەو لە شارەکەی خۆیەتی. نازانم چی بکەم، تۆ ڕات چییە؟"

"باشە ناکرێ، زەواج بکەن و دواتر هەرکەسە کاری خۆی و جار جار بێنەوە لای یەکتری؟"

"من زۆر لەوە دەترسم. دووریی نێوان ژن و مێرد یەکێکە لەو هۆکارانەی ژن و مێرد لێرە لە یەکتر لێك جیا دەبنەوە."

تەماشای لای ڕاست و چەپی خۆم کرد وەك بڵێی بەدوای شتێکدا دەگەڕێم. بەڵام ئەوە مێشکم بوو بەدوای ڕێگەیەکدا دەگەڕا کارلا ڕزگار بکات لەو کێشەیەی تێی کەوتووە.

"باشترین ڕێگە ئەوەیە: پێی بڵێ تۆ کارت دۆزیوەتەوە،" من گوتم. ئەوجا پێکەوە دانیشن چارەسەرێك بۆ ئەمە بدۆزنەوە."

"ئەی ئەگەر ڕازی نەبوو، گۆران، من نامەوێ لە دەستی بدەم." کارلا گوتی.

"ناکرێ لێشی بشارییەوە، چەند ڕۆژ, چەند مانگ ئەمەی لێ دەشارییەوە." من گوتم. "چەند زووتر پێی بڵێی ئەوەندە بۆ هەردووکتان باشترە."

"چی بکەم؟" ئەو پرسی.

"برۆ پێی بڵێ و دواتر پێکەوە دانیشن و باسی کێشەکە بکەن." من هەستام کارلام بەجێ هێشت و گوتم دەڕۆم دەبێ بچمە کتێبخانە.

"کوا یارمەتیت نەدام؟"ئەو گوتی.

"باشترین یارمەتی لێرە بۆ تۆ ئەوەیە بەقسەیەك دەسخەرۆت نەدەم، باشترین ڕێگە ئەوەیە قسەی لەگەڵ بکەیت و پێکەوە گرفتەکە چارەسەر بکەن. ڕای کەسی تر وەرمەگرە بەس دەسگیرانەکەت."

ویستم کارلا فێری ئەوە بکەم کە دەبێ بەردەوام هەرچی لە دڵدا هەیە بەهاوسەرەکەی بڵێ. ژن و مێرد نابێ هیچ لە یەکتری بشارنەوە. بەسەتان ژن و مێرد لەیەکتری جیابوونەتەوە لەبەرئەوەی لەگەڵ یەکتری ڕاستگۆ نەبوونە. بەجێهێشتنی کارلا بەم شێوەیە، وانەیەك بوو کە دەبێ بابەتەکان بۆ دەسگیرانەکەی باس بکات.

لە نیوەی ڕێ ڕای خۆم گۆڕی و گوتم دواتر بەیانی دەچمە کتێبخانە. بۆیە یەکسەر چوومەوە ماڵ.

★★★

دوای چەند رۆژێك لەگەڵ هاورێ ئەفغانییەکەم چووین بۆ سینەما. پێکەوە تەماشای فیلمێکی تازەمان کرد. دەستمان کرد بەگفتوگۆی ئەوەی کە ئەمەریکایی چۆن لە ئەفغانی گەیشتوون.

"تۆ چۆن لە ئەفغانییان گەیشتووی؟"لە منی پرسی.

"ئەگەر بەپێی میدیا بێ، ئەوا شەڕ، تیرۆریزم، دواکەوتوویی، پیاوسالاری و تاد."

"زۆر ڕاستە میدیا ڕووی ئەفغانییەکانی ڕەش کردووە،" ئەو وای گوت. "ئەمەریکاییەکانیش بەهەمان شێوە وا لە ئەفغانییەکان گەیشتوون."

"نەك هەر ئەفغانی بگرە تەواوی رۆهەڵاتی ناوەڕاست بەم شێوەیە وێنەیان بۆ کێشراوە لە بیری رۆژئاواییەکاندا،" من گوتم.

"چ بکەین چارەسەر نییە،" ئەو بەدڵساردی وای گوت.

"چارەسەرێك هەیە من بیری لێ دەکەمەوە،" من گوتم.

"چییە؟"

## ٩

# ئەفغانستانی ڕاستەقینە

شەوێك سەعات دوانزە، یەكێك لە دەرگای دا. منیش دەمویست بنووم، خەوالّوو دەرگاكەم كردەوە. یەكسەر خۆی پیێ دادام و دەستی بەگریان كرد. ماوەی ١٥ خولەك بەس گریا. هەرچەندی دەمگوت چی بووە، بەلاّم هیچ وەلاّمی نەدەدامەوە. ئیلان، هاوڕیێ ئەفغانییەكەم، ئەو شەوە زۆر پەشۆكاو بوو. من وامزانی هەوالّی مردنی باوكی یان دایكی پیێگەیشتووە لە ئەفغانستان. هەندیێ ئاوم بۆ هێنا، تۆزیێ ئاوی خواردەوە و ئەوجا وردە وردە هاتەوە سەرە خۆی.

"چی بووە؟" پرسیم.

"لیزای خۆشەویستم لێم تووڕە بووە، ئێستا پیێكەوە بووین و لەسەر شتێك لێم تووڕ بووە." هەنسكی لێنەدەگەڕا باش قسە بكە.

یەك بەخۆم پێكەنیم و گوتم، "ئەوجا باشە ئەوە ئەو شین و ڕۆڕۆیەی دەویێ!"

"ئاخر نامەویێ لە دەستی بدەم، زۆرم خۆش دەویێ." وای گوت و چاوی پڕ بوو لە ئاو.

هەستم كرد بابەتەكە زۆر جدییە. بۆیە بیرەیەكم لە بەردەمی دانا و گوتم، "لەسەر چی لێت تووڕە بووە؟"

"گوایە من گرینگی بەو نادەم، وا هەست دەكا،" ئیلان گوتی.

"زۆر ئاساییە، بەیانی یان ڕۆژێكی بۆ خۆی دێتەوە لات،" من گوتم. "بڕۆ داوای لێبوردنی لیێ بكە و بلّیێ چۆنت دەویێ وا دەبم."

"كچێكی زەحمەتە وەها بەئاسانی نایەتەوە سەر خەت،" ئەو گوتی.

"زۆر ئاسانە!" من گوتم.

"چۆن؟" پرسی.

"بڕۆ ئەم شیعرەی بۆ بخوێنەوە."

شیعرەکەی لێ وەرگرتم و بەدەنگی بەرز خوێندییەوە.

"زۆر جوانە. بەیانی بۆی دەخوێنمەوە." هەستا رۆیشت. پێش ئەوەی لە ماڵم بچێتە دەرەوە، ناونیشانی ڤیدیۆیەکی دامێ و گوتی برۆ تەماشا بکە لەسەر ئەفغانستانە.

★★★

بەیانی تەماشای ڤیدیۆکەم کرد. ڤیدیۆکە باسی ساڵانی پەنجا و شەستەکانی ئەفغانستانی دەکرد. ئەوساکە گەلێکی کراوە، رۆشنبیر و پێشکەوتوو بوو. نیوەی ئەفغانییەکان بێ سەرپۆش بوون و ژیانێکی ئارام و دوور لە ترس و دڵەڕاوکێ دەژیان. ئەفغانستانی ئەوسا پێشکەوتووتر بوو لە گەلێ وڵاتی پێشکەوتووی ئێستا. بەڵام رەوتی ئیسلامی سیاسی کۆمەڵگەی پێشکەوتووی ئەفغانی گۆڕی بۆ کۆمەڵگەیەکی داخراو، دواکەوتوو و پابەند بەهەندێ نەریت کە تێکەڵ کراوە لەگەڵ ئیسلام ئەگینا هیچ پێوەندییێکی بەئیسلامەوە نییە. بۆ وێنە: نەریتی رەوتی ئیسلامی سیاسی و هۆزەکان پیاوسالارییان بەسەر کۆمەڵگەی ئەفغانیدا سەپاندووە، ئیسلام بەهیچ شێوەیەك رێ نادا پیاو بەو شێوەیە زاڵ بێ بەسەر ئافرەتدا. هێندەی ئیسلام مافی ژنانی داوە، هێندە گرینگی بەپیاو نەداوە. بەڵام داب و نەریتی خێڵەکی لەگەڵ ئیسلام تێکەڵ کراوە. ئەمە نەك هەر لە ئەفغانستان، بگرە لە تەواوی وڵاتانی رۆهەڵاتی ناوەڕاست و وڵاتانی تری عەرەبیش. پێش هاتنی ئیسلام، عەرەب ئەگەر کچیان بووایە زیندە بەچاڵیان دەکرد، بەڵام ئیسلام هات ئەوەی قەدەخە کرد و مافی ژیانی دا بە ئافرەتان. لە قورئاندا، سورەتێك هەیە بەناوی ئافرەتان کە باس لە مافەکانی ژنان دەکا. زۆربەی خەڵك لەهەڵە لەو ئایەتە قورئانییە تێگەیشتوون کە باس لە لێدانی ئافرەتان دەکا. کەس ناچێتە بنج و بناوانی تا بزانن ئەسڵی ئایەتەکە چۆنە و و لێدانەکە چۆن و کەی دەبێ.

رەوتی توندڕۆی ئیسلامی سیاسی تیرۆری دروست کرد، تیرۆریش کۆمەڵگەی ئەفغانی ناشرین کرد. وڵاتانی زلهێزی دنیا تیرۆریان دروست کرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی یەکتر، ئێستەش هەرچی دەکەن پێیان لەناو ناچێت، چونکە لێیان هەڵگەڕاونەتەوە.

ئەفغانی لە ژێر رێژیمی خێڵەکی هەڵە تێگەیشتوو لە ئیسلام مێشکیان شوورایەوە و رۆژ لە دوای رۆژ بەپاشکەوتن.

★★★

"لیزا لەگەڵت ئاشت بووەوە،" یەکەم پرسیارم ئەوە بوو کاتێ دوای نیوەڕۆ بینیمەوە.

"زۆر باش بوو، کاتێ شیعرەکەم بۆ خوێندەوە، دەستی بەگریان کرد و لەباوەشی کردم،" وای گوت.

"ئەوێ رۆژێ گوتت، بیر لە شتێك دەکەیتەوە بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییی نێوان ئەفغانی و ئەمەریکی. پێم بڵێ بیر لە چی دەکەیەوە."

"گۆڕان لە کۆمەڵگەی ئەفغانی تەنێ بەخەڵکی ئەفغانستان دەکرێ،" من لەسەر خۆ گوتم. "نەك هەر ئەفغانی، بگرە کۆمەڵگەی سوری، ئێرانی، میسری، تونسی، مەغریبی، لیبی و جەزائیری و تەواوی وڵاتانی تری هاوشێوە."

"لەگەڵتم، بەڵام چۆن؟"

"بۆ ئەم گۆڕانەش پێویستتان بەسەرۆکێك هەیە لە ناخی میللەتەوە هەڵقوڵا بێ و رۆشنبیر بێ،" گوتم.

"مەبەستت ئەوەیە خەڵك راپەڕێ و ئەوەی هەیە لە ناوی بەرێت و سەر لە نوێ دروستی کاتەوە؟" ئیلان گوتی.

"ئەمە بۆ وڵاتانی عەرەبی راستە، بەڵام ئەفغانستان بەشی لەناوچوونێکی تر ناکات. خەڵك دەبێ هەموو ئەوانە بەدەر نێن کە دەستیان لەگەڵ گرووپی تیرۆریستی دا هەیە. دەبێ شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی و ئایینی روو بدا لە ئەفغانستان."

"وڵاتە زلهێزەکان چۆن تیرۆریان دروست کرد، ئاواش دەبێ لەناوی بەرن،" ئیلان گوتی. "تیرۆر بەگەلی هەژاری ئەفغانی لەناو ناچێت."

هەردووکمان برسیمان بوو و چووین لەفەیەکی سەرپێیمان خوارد.

"خەڵك دەبێ رۆشنبیر بکرێتەوە، دەبێ بیری جارێکی تر بشوورێتەوە، چونکە مێشکیان پڕە لە بیرۆکەی بۆگەنی و قەپات بووە." من بەدەم خواردنی لەفەوە وام گوت.

"ڕاست دەکەی . . . هەروەها پەروەردە و سەرۆکی باش و دڵسۆز،" ئیلان گوتی.
"نەك هەر ئەفغانستان تەواوی وڵاتانی ڕۆهەڵاتی دەبێ پەروەردە بکرێن و سەرۆکی باشیان هەبێ و دین لە داب و نەریتی خێڵەکی و کۆن جودا بکەنەوە."
"ڕێگەیەکی تر هەیە بۆ ئەوەی گەلانی ڕۆهەڵاتی و ڕۆژئاوایی لە یەکتر نێزیك ببنەوە و بەهەڵە لە یەکتر تێنەگەن،" من گوتم. "دروستکردنی دۆکیومێنتەری لەسەر لایەنە جوانەکانی، بۆ وێنە، ئەفغانستان. دەزانی هەرچی هەیە لەسەر میدیا دیوی ڕەشی ئەفغانییەکان پێشان دەدات. من بێگومانم لەوەی کە خەڵکی کراوە، ڕۆشنبیر و دیموکراتخواز هەیە لە ئەفغانستان. دەکرێ بەپێشاندانی ئەمانە لەگەلانی ڕۆژئاوایی، بەتایبەتی ئەمەریکا، بگەیەنرێ کەوا هەموو ئەفغانییەك تیرۆریست نییە."
ئیلان هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و لەفەکەی تەواو کرد و قومێك ئاوی لەسەر کرد. پارەکەمان دا و هاتینە دەرەوە. هەردووکمان لەسەر ئەوە ڕێککەوتین بەپێیان بەرەو ماڵ بچینەوە.
"ڕووسیا و ئەمەریکا ئەفغانستانیان تێك دا،" ئەو بەدەنگێکی هێواش گوتی.
"بەڵام ئەمەریکا ئێوەی لەچنگ تالیبان ڕزگار کرد، وەك چۆن ئێمەی لە چنگ سەدام ڕزگار کرد." من گوتم.
"ڕاستە، ئەمەریکا ئێمەی ڕزگار کرد، بەڵام وڵاتەکەشی وێران کرد."
"ئەمەریکا عێراقیشی وێران کرد، بەڵام ئەوە ئەرکی سەرانی ئەو وڵاتەیە بنیاتی بنێنەوە."
"کوا ئەم کارە دەکەن؟" ئەو پرسیاری کرد.
"نەخێر هیچ سەرکردەیەکی ئێستەی عێراق خاوەن کارنامەی خۆی نییە. عێراق بەوانە دروست نابێتەوە."
لەو قسانەدا بووین، مۆبایلی ئیلان لێی دا.
"دەبێ هەر ئێستە بڕۆم، لیزایە،" گوتی دوای ئەوەی تەماشای مۆبایلەکەی کرد.
"خوات لەگەڵ،" گوتم.
خێرا لە ماڵی من چووە دەرەوە.

★★★

سێ رۆژ دواتر لە ماڵی کریستینی، هاوڕێیەکی ئەمەریکاییام، بە هۆت دۆگ و پان کێیك و کۆرن داوەت کرام. لەوێ، کەپڵێکی تریشی لێ بوو و یەکتریمان ناسی. دوای ئەوەی نانمان خوارد، کەوتینە گفتوگۆ لەبارەی تیرۆریزم، چونکە کریستینی هاوڕێم باسی هەواڵی تەقینەوەیەکی کرد لە پاکستان کە بووبووە کوژرانی چوارسەت و پەنجا کەس.

"گۆران، بەڕای تۆ ئەو خەڵکە چۆن دڵی دەچێتێ خۆی بتەقێنێتەوە؟"

## ١٠

# سێکس و تیرۆریزم

ئەو کچەی هاتە خەونم تیرۆریست بوو. کچێکی زۆر جوان، سەر تا پێی ڕەشی پۆشی بوو. لە خەونەکەدا من لەگەڵ کوڕەکەم و خێزانەکەم لە پارکی منداڵان بووین. پارکەکە نێزیکەی هەزار منداڵی لێ بوو. من لەناکاو ئەو کچەم بینی و هەڵسوکەوتی ئاسایی نەبوو. لێی نێزیك بوومەوە و تووند دەستم گرت. دەیویست ئەو دەمە خۆی بتەقێنێتەوە. دەستەکەی تریشم تووند گرت و دامنیشاند. هەموو لەشی دەلەرزی.

"بۆچی دەتەوێ ئەم کارە بکەی؟" من پرسیم. "ئێستە رادەستی پۆلیست دەکەم، بەڵام دەمەوێ بزانم بۆچی ئەو کارە دەکەی."

"هیچم نییە بیدۆڕێنم!" بەدەنگێکی نووساو وای گوت. "لە ژیانم بێزارم."

چاوەکانی پڕ بووبوون لە فرمێسك. ویستی خۆی راپسکێنێ و را بکات. بەڵام نەمهێشت. خێرا قایشەکەم لە پشتی کردەوە. لەو خەونەدا من لە پووچەڵکردنەوەی تەقەمەنی شارەزا بووم. بۆیە پووچەڵم کردەوە.

★★★

لە خەونێکی ترم دا، هەمان کچ هاتەوە خەونم. هەمدیس دەیویست خۆی بتەقێنێتەوە لە ناو بازاڕ. بەڵام کە بینیم دەستی لەسەر دوگمەکە بوو بیتەقێنێتەوە.

"تکایە خەڵکی بێ تاوان مەکوژە،" لێی پاڕامەوە. "شتێکت بۆ دەکەم کە هەرگیز جارێکی تر خۆت نەتەقێنییەوە. دەتوانم هیوات بۆ دروست بکەم. تکایە واز لە خەڵکی بێ تاوان بێنە."

کاتێ ئەمەی لە دەمی من بیست، تاسا و وەستا. تەماشای ناو چاوی کردم. چاوەکانی پڕ بووبوون لە فرمێسك.

"چیم بۆ دەکەی؟" پرسی و دەستی لەسەر دوگمەکە هەڵگرت.

لە خەونەکەمدا، لە ناوەندی بازاڕ دەرگەی گەرماوێك بەرامبەرمان کرابووەوە. هەڵم و بوخاری لێ دەهاتە دەر. بەدەست ئاماژەم بۆ کرد بچێتە ناو گەرماوەکە. بە دوودڵییەوە هەنگاوی ناو و چوە ناو گەرماوەکە. دوای ئەوە یەکسەر خۆم کرد بە گەرماوەکە، گەرماوێك زۆر گەرم و خۆش بوو. جلەکانم لەبەر کردەوە و رووت و قوتم کردەوە.

"قەت کەس رەحەتی کردووی؟" پرسیم و تەماشای ناو چاوم کرد.

"مێردم هەبوو، بەڵام قەت منی رەحەت نەکردووە،" ئەو گوتی. "پێم خۆش بوو خۆی تەقاندەوە و لەکۆڵ من بووەوە."

"ئەوانەی تامی رەحەتبوون بکەن لە ژیان، قەت خۆیان ناتەقێننەوە،" هەر لە خەونەکەمدا وام پێ گوت و توند دەمیم مژی.

دواتر وردە وردە بەگەردەن و مەمکیدا چوومەوە خوارەوە. ماوەی سەعاتێك هەموو لەشیم مژی و رەحەتم کرد. دوای ئەوە دەستی کرد بەگریان.

"زۆر سوپاس،" بەگریانەوە گوتی. "من بێ بەشم لە چێژی ژیان. بۆیە دەمویست خۆم لەناوبەرم!"

کاتێ کریستین ئەم پرسیارەی لە من کرد، دالغەم رۆیشت و ئەو دوو خەونەی خۆمم بەبیر هاتەوە.

"گۆران، لەگەڵ تۆمە،" کریستین پرسی. "بۆ کوێ چووی، دیسان بیری ماڵ و منداڵت دەکەی؟"

بەدەنگی ئەو بەخۆم هاتمەوە و داوای لێبوردنم کرد و قوومێك ئاوم خواردەوە.

"پرسیارەکەت زۆر جوانە،" گوتم. "دوو دەقەم بدەرێ دەچمە ئاودەست و دێم وەڵامتان دەدەمەوە."

بەپەلە چوومە ئاودەست و گەڕامەوە. هەر سێکیان چاوەڕێی منیان دەکرد. دەیانویست بزانن خەڵك چۆن خۆی دەتەقێنێتەوە. حەزیان دەکرد رای یەکێکی رۆهەڵاتی ببیستن لەو بارەیەوە.

"پێنج هۆکار لەپشتی ئەوەیە بۆچی گەنجێك یان ئافرەتێك یان هەر یەکێکی تر خۆی دەتەقێنێتەوە و کۆتاییی بە روحی خۆی و سەتان کەسی بێتاوان دەینی،" بەدەنگێکی گڕ گوتم. "من وەك رۆژنامەنووس زۆر لەو پرسەم کۆڵیوەتەوە، چونکە ئەم پرسیارە بەردەوام بەمێشکمدا دێ کاتێ گوێم لە هەواڵی تەقینەوەی خۆکوژی دەبێ."

کریستین و کەپلەکە گوێیان شل کردبوو و حەزیان لێ نەبوو من بەهیچ شێوەیە بوەستم.

"بێ بەشبوون لە تام و چێژی ژیان، بێ پارەیی، شووشتنەوەی مێشکی کەسانی نەزان و نەخوێندەوار و بێهێز و ئاست نزم، رفاندن و زۆرلێکردن لەگەڵ شیکردنەوەی قورئان بەهەڵە بۆ خەڵکی،" بەم شێوەیە هۆکارەکانم بۆ هەرسێکیان ریز کرد.

لە دەموچاویان خوێندمەوە کەوا لە هیچ هۆکارێکی سەرەوە نەگەیشتوون.

"با هۆکاری یەکەمتان بۆ شی بکەمەوە،" بەردەوام بووم. "من زۆرجار بەخەڵکی دەڵێم هەر کەسێکی خۆتەقێنەرەوە، دوو دەقیقە پێش ئەوەی کارەکە بکات، رەحەتی بکەی و چێژی ژیانی پێ ببەخشی، بەحەیاتی خۆی بیر لە خۆتەقاندنەوە ناکاتەوە."

ئەو رستەی کۆتاییم زۆر راستەوخۆ و بەلای ئەوانەوە بێ مانا بوو. بۆیە هەر یەکە بەجۆرێك چاوی ئەبڵەق بوو.

"چۆن، گۆران، مەبەستت چییە؟" کریستین پرسی.

"ئەمە پێی دەڵێن بێ بەشبوون لە ژیان. خۆشترین چێژ چییە لە ژیان. بەڕای من سێکس، و خواردن و خۆشەویستییە. ئەوانەی خۆیان دەتەقێننەوە، بێ بەشن لەو چێژانە و دەیان چێژی تر."

هەرسێکیان کەمێك لە مەبەستم تێگەیشتن و سەری ئەرێیان بادا.

"هۆکاری دووەم واتە زۆرێك لەوانەی خۆیان دەتەقێننەوە بۆ پارە ئەو کارە دەکەن،" بەردەوام بووم.

"بەڵام خۆیان نامێنن، ئەو پارەیان بۆ چییە،" یەکێ لەو دوو کەپڵە پرسی کە ناوەکەیم لە بیر نەماوە.

"زۆر ماڵبات هەیە هیچیان نییە و منداڵیان زۆرە،" گوتم. "جاری وا هەیە منداڵیان دەنێرن بۆ ئەو گرووپە تیرۆریستییانە بە پارەیەکی زۆر."

"ئەمە شێتانەیە!" هەرسێکیان گوتیان.

"ماڵبات هەیە، پیاوەکە پارەیەکی زۆر قەرزدارە و رازی دەبێ خۆی بتەقێنێتەوە بۆ ئەوەی قەرزەکەی بۆ بدەنەوە و ماڵ و منداڵی دواتر لە خۆشیدا بژین،" بەردەوام بووم.

"ئەی هۆکاری سێیەم مانای چییە؟" کریستین پرسی.

"ماناکەی لە خۆیڕا دیارە،" گوتم. "گرووپە تیرۆریستییەکان دەگەڕێن بەدوای کەسانی نەخوێندەوار، بێ پارە، بێ بەش لە ژیان. دەیانهێنن و لە مێشکیان دەخوێنن بۆ ماوەیەکی زۆر تا تەواو قەناعەتی پێ دەکەن کە خۆتەقاندنەوە شتێکی باشە."

"ئەی خوایە، ئەوە چ ئەقڵییەتێکە،" هەرسێکیان گوتیان.

"هۆکاری چوارەمیش ئەوەیە گرووپە تیرۆریستییەکان منداڵ یان ئافرەت یان کەسانی تر دەڕفێنن و دواتر بۆ کاری تەقاندنەوە بەکاریان دێنن،" بەردەوام بووم. "جاری وا هەیە سەرخۆشیان دەکەن بەحەب و مەشروبات ئەوجا دەیاننێرن بۆ شوێنی مەبەست."

هەرسێکیان سەریان بادا و کریستین پرسی، "گۆران تۆ ئەمانە لەکێ دەزانی؟"

"ئەوانە را و لێکدانەوەی خۆمن لە ئەنجامی بیرکردنەوە و خوێندنەوە،" ئەوەم گوت و چوومەوە سەر هۆکارەکان. "هۆکاری پێنجەم خراپترین کارێکە ئەو گرووپە تیرۆریستییانە دەیکەن."

هەرسێکیان تەماشای لێوی منیان دەکرد و بە پەرۆش بوون زیاتر بزانن.

"لە هیچ شوێنێك لە قورئان و لە دینی ئیسلامدا، باسی تیرۆر و کوشتن و تۆقاندنی خەڵك نەکراوە. ئەم گرووپە تیرۆریستییانە دێن لێکدانەوەی هەڵە بۆ ئایەتەکان دەکەن و خەڵکی پێ رازی دەکەن و درۆ دەکەن بەناوی خوا و پێغەمبەر."

"ئەی باشە خەڵك بۆ خۆی تێناگات و نایخوێنێتەوە؟" کریستین پرسی.

"خەڵکی نەخوێندەوار زۆرە. دواتر ئەو گرووپانە بەشێوەیەك تەفسیر دەکەن کە دەڵێن ئەو مانایەش دەدا. زۆرجار شت بەکەیفی خۆیان بۆ دروست دەکەن. بۆیە لە منی وەرگرن کە خەڵکی رۆهەڵاتی ناوەڕاست و دینی ئیسلام هیچ پێوەندییان بەتیرۆریزمەوە نییە. کۆمەڵێك گرووپن بەناوی ئیسلامی سیاسی و خواوە ئەو کارە ناڕەوایە دەکەن."

"گۆران، بەڕاستی زۆر سوپاس بۆ ئەم روونکردنەوانە، ئێمە هیچ ئاگەداری ئەمانە نەبووین،" کریستین گوتی و کەپڵەکەش کە ناوم لە بیر نەماون پاڵپشتیان کرد.

سوپاس بۆ داوەتەکەت.

★★★

رۆژێك لە وانەی ئازادیی رۆژنامەوانی تەواو بووم کە لەلایەن پرۆفیسۆر تۆم ڤۆلیك دەگوترایەوە لە زانکۆی کانزەس. تۆم تا سەر ئێسقان خۆی ئامادە دەکرد تا قوتابیان باش تێبگەن، من کەیفم بەو خۆماندووکردنەی تۆم دەهات. دوای تەواوبوونەکەم هاتمە دەرەوە و یەکسەر بای ساردی لۆرێنس بەنێو ئێسکەکانمدا رۆچوو. موچڕکێك بەلەشمدا داهات. لە ناکاو سیڤەری هاورێم کە خەڵکی مایامی بوو لە پشتەوەڕا بانگی کردم.

"هێی گۆران . . ."

منیش وەستام و ئاوڕم دایەوە، بینیم سیڤەرە. سیڤەر کچێکی بەژن مامناوەندی ناوقەد باریك و دەموچاو سوروسپی بوو. کزە بایەکەی لۆرێنس هێواش هێواش بسکەکانی دەشەکاندەوە. راوەستام هەتا لێم نێزیك بووەوە ئەوجا دەستم کرد بەرۆیشتن و ئەویش لە تەکەمدا بوو.

"دەتوانم پرسیارێك بکەم،" بەدەنگێکی نزم گوتی.

"بۆ نا، هەرچی پرسیارێکت هەیە بیکە،" من دڵنیام کردەوە. "لە بیرت چوو، من رۆژنامەنووسم، هەر چیت دەوێ بزانی لێمی بپرسە لەبارەی رۆهەڵاتی ناوەڕاست."

"زۆر باشە،" ئەو گوتی. "پرسیارەکەم ئەوەیە، بۆچی خەڵکانی رۆهەڵات وڵاتی خۆیان بەجێ دێڵن بۆ رۆژئاوا؟"

# ١١

# خزمەتگوزارییە سەرەتاییەکان

دووکەڵێکی رەش لە گەرماوەکەی ماڵمان هاتە دەرەوە. هێندەی نەبرد دووکەڵ ئەو ناوەی داپۆشی و دنیا ڕەش داگەڕا. باوکم بەکۆکە کۆك هاتە دەرەوە و هەناس بڕکێ بووبوو. هێندەی نەما بوو بخنکێ. هێندەی نەبرد ئێمەش دەستمان بەکۆکە کۆك کرد، لەباتی هەوا قیڕاومان هەڵدەمژی. خێرا هەرچۆنێك بێ راپەڕینە دەرەوە و دەرگە و پەنجەرەکانمان کردەوە. باوکم، سەباح، دەستی کرد بەجوێندان و رەخنەی لە حکوومەت و سیستەم و دەسەڵات گرت. ناهەقی نەبوو، چونکە بێنە بەرچاوت بەچلەی زستان بەپەرەمێز خۆت بشۆی و لەنیوەی خۆشووشتنەکە پەرەمێزەکە بکوژێتەوە و دووکەڵ هەموو گیانت داپۆشێ. تۆش هیچ نەکەی بەو سەرمایە ناچار دەرپەڕیە دەرەوە. جاری وا هەیە کە پەرەمێزەکە هەڵدەچێت، دوور نییە تۆش گڕبگری و بسووتێی و ببیە شەهیدی پەرەمێز.

باوکم ماوەی هەفتەیەك بوو گەڕا بووەوە لە هۆڵەندا. یەکەم رۆژی لە عێراق زۆر دڵخۆش بوو، بەڵام دواتر پەشیمان بووەوە لە هاتنەوەی. من دڵنیام رۆژی هەڵچوون و کوژانەوەی پەرەمێزەکە لووتکەی پەشیمانی باوکم بوو، چونکە تا ماوەیەکی زۆر رەخنەی لە هەموو شتێك گرت. هەموو جار دەیگوت لە ئەورووپا گرفتی ئاوی گەرم، کارەبا، غاز، سەرما و گەرمات نییە. ئەگەر لە دەرەوە بیبەستێ، دەتوانی لە ژوورەوە بەڕووتی بسووڕێیەوە. زۆربەی کاتەکان، باوکم تەنێ باسی خزمەتگوزارییەکانی دەکرد.

هەر پرسیارێکت لێ کردبا لەبارەی ئەوڕوپا دەیهێنایەوە سەر بەراوردکردنی خزمەتگوزاری لە عێراق و لە ڕۆژئاوا.

تەمەنم ١٥ ساڵ بوو کاتێ باوکم من و سێ براو وچوار خوشکمی بەجێ هێشت و چووە ئەوروپا. ماوەی چوار ساڵ لێمان دوور کەوتەوە. ماوەی ئەو چوار ساڵە ئێمە هەر هەشتمان لەگەڵ دایکم مەرگمان بەچاوی خۆمان دیت. لە مەرگێك زیاترمان بینی. مەرگ هەموو ڕۆژ بەجۆرێك خۆی پێشان دەداین. گرانی بوو، ئێمە کەسمان هی ئەوە نەبووین ماڵ و منداڵ بەخێو بکەین. من و برا گەورەکەم، سۆران، ئەرکی بەخێوکردنی ماڵەوەمان کەوتە سەر شان. ئیشمان دەکرد، من دەشمخوێند. بەدەیان جار چوومەتەوە ماڵ، دایکمم دەدی فرمێسکی چاوەکانی دەسڕییەوە. باوەڕ ناکەم نیرۆنیش هێندەی دایکم گریا بێ لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا. ژیانێکی ئێجگار قورس ژیاین. لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا، هیچ ڕۆژێك لە قوتابخانە نەك لەفە بگرە چوکلێتیشم نەخوارد لەبەرئەوەی هەموو ڕۆژ بەگیرفانی بەتاڵ دەچوومە قوتابخانە. چوار ناخۆشترین ساڵ بوو لە ژیانم.

ئیتر باوکم هەوڵی دا ئێمەش لەگەڵ خۆی ببات، بۆ ئەوەی ئێمەش تامی خزمەتگوزارییەکان بکەین. چی تر لەبەر پەرەمێز هەفتەی جارێك خۆمان نەشۆین، بگرە هەموو بەیانییەك کە هەستاینەوە خۆمان بشۆین. بەڵام بۆی نەهات و گەڕایەوە. ڕۆژی هەڵچوونی پەرەمێزەکە، گوێم لە باوکم بوو گوتی: "دەفەرموو دەی ئەوەش عێراق."

پەرەمێز ئامێرێکە بەنەوت ئیش دەکات. خەڵکی عێراق ئێستەش بەکاری دێنن بۆ گەرمکردنی ئاو و گەرماو بۆ خۆشووشتن. جاری وا هەیە بۆ چێشتلێنانیش بەکاری دێنن. تا ئێستە سەتان ئافرەت و پیاو بوونەتە قوربانی، چونکە زۆرجار هەڵدەچێت و گڕ دەگرێت و گەرماوەکە دەبێتە یەك پارچە ئاگر. ئەمە نموونەیەکی زۆر سادەی ئازارەکانی ڕۆژانەی خەڵکی عێراقە.

★★★

کاتێ سیڤەر ئەو پرسیارەی لێ کردم، من یەکسەر ڕۆژی هەڵچوونی پەرەمێزەکەم بیر کەوتەوە، کە چۆن باوکمی بێزار کرد و هێندەی نەما بوو هەمووومان بخنکێین.

رووم لە سیڤەر کرد و گوتم، "خەڵك بۆ خۆشووشتن دێنە ئەمەریکا!"

تەماشایەکی کردم و لێوەکانی قیت کردنەوە وەك ئاماژەیەك بۆ تێنەگەیشتن. بەهیچ جۆرێك لەو شتانەی بەبیر مندا هاتنەوە تێنەدەگەیشت.

"ئەوەی لە وڵاتی خۆی رادەکات بەرەو رۆژئاوا، لەبەر ژێرخانی خزمەتگوزارییە،" من بەردەوام بووم.

"تێناگەم . . ." سیڤەر گوتی.

"کارەبا، ئاوی گەرم بەزستان، سیستمی گەرمی و ساردی، رێگەوبان، هاتووچۆ، سیستمی پۆستە و تاد،" من گوتم. "خەڵك ئەو شتانەی نییە لە وڵاتی خۆی، بۆیە بەرەو رۆژئاوا رادەکات."

"بەڵام ئەو شتانە لێرە بەپارەیە، خۆ بەلاش نین،" سیڤەر مشتومڕی کرد.

"دەزانم، خەڵك ئامادەیە پارە بدات،" من گوتم. " بۆ نموونە لە عێراق پارەش دەدەی بەڵام کارەباکە هەر باش نییە."

"خەڵك هەیە لێرە ناتوانێ مانگانە پارەی خزمەتگوزارییەکان بدات،" ئەو گوتی.

"راستە لە هەموو شوێنێك خەڵکی هەژار و کەم دەرامەت هەر هەیە،" من گوتم. "ژێرخانەکە هەیە لێرە، راستە گران و حکوومەت دەبێ جەخت لە کۆمپانیاکان بکات نرخی خزمەتگوزارییەکان دابەزێنن."

"مەبەستت هەر ئەو هۆکارەیە خەڵك روو لە رۆژئاوا دەکات؟" سیڤەر پرسی.

★★★

هەردووکمان چاوەڕێی پاسمان دەکرد بۆ ئەوەی بچینەوە ماڵ. لەو قسانەدا بووین، پاسەکەمان لە کیس چوو، چونکە ئاگامان لێ بڕا. ئەمە وای کرد گفتوگۆکەمان بەردەوام بێ.

"هۆکاری ڕاستەقینە ئەوە،" دەستێکم بەسەر و پرچمدا هێنا و گوتم. "هۆکاری تر هەیە لەوانە خەڵك بە ژیانی ناو فیلمەکان هەڵدەخەڵەتێ و وا دەزانی رۆژئاوا بەهەشتە."

"وایە."

"گەنج هەیە مەراقی لە ژیانی شەوانەی رۆژئاوادایە و خەون بە دیسکۆ و نایتکلَب و کچوکاڵەوە دەبینێ."

"بەڕاستی؟" سیڤەر بەپێکەنینەوە پرسی.

بایەکە ساردتر بوو، بۆیە هەردووکمان چووینە ناو باڵەخانەی بەیلی بۆ ئەوەی لە ژوورەوە چاوەڕێی پاس بکەین، چونکە بای ساردی شاری لۆرێنس وەك گیزان دەموچاو دەبڕێ.

"گەنج هەیە وا دەزانێ هەموو ئافرەتێکی ئەمەریکی ئاسانە بۆ سێکس و هەموو لەگەڵت دێنە دەرەوە شەوانە بۆ نایتکلەب و دواتریش سێکس،" بەردەوام بووم.

سیڤەر بەدەنگێکی بەرز پێکەنی.

"هۆکاری تریش هەیە وەك نایەکسانی کۆمەڵایەتی، گەندەڵی، دیکتاتۆریەت، چەوساندنەوە،" بەردەوام بووم.

"ڕاست دەکەی،" سیڤەر گوتی. "هەندێ برادەری ئافریکاییم هەن لەبەر زۆرداریی سەرۆکەکەیان هەڵاتوون."

"برادەرێکم هەیە زۆرجار دەڵێ حەز دەکەم ببم بەخاوەنی پاسپۆرتی ئەمەریکی، چونکە بەهێزترین پاسپۆرتە لە دنیا. ئیتر خەڵك هەیە تەنێ لەبەر ئەوە سەری خۆی هەڵدەگرێ بەرەو نادیار، چونکە بۆ نموونە پاسپۆرتی عێراقی زۆر بێ نرخە و ڤیزەش بەزەحمەت وەردەگری، چونکە عێراقی."

لەو قسانەدا بووین پاسی سیڤەر هاتەوە و بەپەلە خواحافیزی کرد و بەدەم ڕۆیشتنەوە گوتی جارێکی تر گفتوگۆکەمان تەواو دەکەین.

دوای خولەکێك پاسەکەی منیش هات و سەرکەوتم.

★★★

پاسەکە زۆر قەرەباڵغ بوو، چاوم گێڕا شوێنێك ببینمەوە. لەپڕ کاتاکی هاوڕێم بەدەست ئاماژەی بۆ کردم و چووم لە تەك ئەودا دانیشتم. جێ قوونم گەرم نەکردبوو ئەو هاتە سەر باسی سانکسگیڤینگ.

"سانکسگیڤینگت چۆن بوو؟" پرسی.

## ١٢

# سانكسگيڤينگی ئاسيايی

چوارەم پێنجشەمی نۆڤێمبەر، سەعات دەی بەيانی لە هوتيل بەپەلە هاتمە خوار بۆ لای پرسگە. ئەوانەی لە هوتێلەكە كاريان دەكرد هەموو خەڵكی كۆريای باشوور بوون، چونكە هوتێلەكە لە گەڕەكی كۆرييەكان بوو لە لۆس ئەنجلۆس، كاليفۆڕنيا و هی كۆرييەك بوو. ئەو ڕۆژە سانكسگيڤينگ بوو و من چوو بوومە ئەوێ بۆ گەشت. چوار ڕۆژی ئەو پشووەم قۆستەوە و چووم بۆ لۆس ئەنجلۆس و سانفرانسيسكۆ. نەمويست خوانی سانكسگيڤينگ لە دەست بدەم، بۆيە لە كچەكەی پرسگەم پرسی.

"هيچ خێزانێكی ئەمەريكايی دەناسی بۆ ئەوەی داوەتم بكەن بۆ سانكسگيڤينگ؟"بە دوودڵييەوە پرسيم.

ئەو خەريكی نووسينی شتێك بوو، سەری بڵند كرد و سڵاوی لێ كردم. زۆر كەيفی بەمن دەهات، چونكە بەكۆری پێم دەگو چۆنی و پێم دەگو سوپاس. ئيتر ئەو ڕستە كۆريە منی لای ئەو كۆرييانە خۆشەويست كرد بوو.

"مەبەستت چييە؟" كچەكە پرسی.

"نامەوێ سانكسگيڤينگ لە دەست بدەم لە ئەمەريكا؟"

ئەمە بەلای ئەو زۆر سەير بوو، چونكە چيرۆكی منی نەدەزانی. بەلای ئەو من ئەمەريكاييم، چونكە لە كاتی چێك ئين من ناسنامەی ويلايەتی كانزەسم پێ بوو.

"باشە، ئەی خێزانی خۆت، بۆ لەگەڵ ئەوان سانكسگيڤينگ ناكەيت؟" ئەو پرسی.

"من خەڵكی عێراقم. بەس ئەو سانكسگيڤينگەم لێرە هەيە و ساڵی داهاتوو ئەو وەختانە لێرە نابم و دەگەڕێمەوە. بۆ گەشت هاتوومەتە لۆس ئەنجلۆس و هيچ ئەمەريكاييەك لێرە ناناسم. لە كانزەس بوومايە گرفتم نەبوو، چونكە زۆر ئەمەريكايی دەناسم لەوێ. بەڵام

ئەوە یەکەم جارمە لێرە لە لۆس ئەنجلۆس. تکایە یارمەتیم بدە بۆ من زۆر گرینگە ئەزموونی سانکسگیڤینگ بکەم."

چاوەکانی زەق بووبوو. هەقی خۆی بوو تێم نەگا.

"تکایە، بەجدیمە، هیچ کەسێکی ئەمەریکایی ناناسی داوەتم بکات بۆ سانکسگیڤینگ؟" دووبارەم کردەوە. "دەزانی، مەبەستم خواردنەکە نییە، بەڵام مەبەستم ئەوەیە لەو کولتوورە بزانم و ببینم ئەمەریکاییەکان چۆن یادی ئەو رۆژە دەکەنەوە."

کچە کۆرییەکە، کە چاوەکانی گەورەتر بوون لە چاو ئاسایی کۆری، تاسا بوو و هەر تەماشای دەکردم.

"بەس تەماشام بکە، تکایە، کەس دەناسی یان نا؟" خێرا گوتم.

"کەس ناناسم، بەڵام من داوەتت دەکەم و دەتوانی بێی لەگەڵ خێزانی من سانکسگیڤینگ بکەیت!"

ئەو جارە ئەو بەم وەڵامە منی تاساند. چونکە سانکسگیڤینگ تەنێ هی ئەمەریکاییەکانە. نەمزانیوە قەت ئاسیایی سانکسگیڤینگ بکەن.

"ئێوەش سانکسگیڤینك دەکەن؟" من پرسیم.

"بەڵێ."

"بەڵێ . . . ئێوە کۆرین . . . ."

"ئێمە کۆریی ئەمەریکایین، لێرە لە دایك بووینە،" جیجی وای گوت دوای ئەوەی ناوی خۆی پێگۆتم.

"سەعات یەك و نیو لێرە ئامادە بە و پێکەوە دەچینە ماڵی ئێمە، سەعات دوو نان دەخۆین،" ئەو گوتی.

"بەڵێ باشە، زۆر سوپاس."

★★★

من زۆر دوودڵ بووم بەو داوەتەی ئەو. حەزم دەکرد لەگەڵ خێزانێکی ئەمەریکایی ئەو یادەم کردبا بۆ ئەوەی قووڵ لە کولتووریان تێگەیشتبام. هەرچەندە

ئەوان لە ئەمەریکا لە دایك بوونە، بەڵام هەر بەکۆری حسێبن. هەرچۆنێك بێ سەعات یەك و نیو لە پرسگەی هوتێلەکە ئامادە بووم و بەئۆتۆمبیلی جیجی چووینە ماڵی ئەوان. هەرکە گەیشتین و چووینە ژوورەوە، جیجی منی بەدایك و باوك و خوشك و براکەی ناساند و دوو کەسی تری کۆریشی لێ بوون و لەگەڵ ئەوانیش یەکتریمان ناسی. یەکسەر دەستمان بەنان خواردن کرد. لەسەر مێز وەك ئەمەریکاییەکان قەل، ماش پەتاتەت، ستەفینگ، پەمپکین برید، یامس، کرانبێری سۆس، و گرێیڤی ریز کرا بوون. وەك ئەمەریکاییەکان پێش نانخواردن دەستیان کرد بەدوعا. هیچیان لێ تێنەگەیشتم، چونکە ئەوان بەکۆری قسەیان دەکرد. منیش لە دڵی خۆمدا گوتم خوایە ماڵ و منداڵم بپارێزی. ئەوە بوو دوعای من. وەك ئەمەریکاییەکان تا تەنگەمان هێشتا نانمان خوارد.

"ئەگەر بۆم هەبێ پرسیارێك بکەم، ئێوە بۆچی سانکسگیڤینگ دەکەن؟" من دوای تەواوبوونی نانخواردن ئەو پرسیارەم ئاراستەی هەموویان کرد.

"بۆ قەل،" هەموو بەپێکەنینەوە گوتیان.

★★★

ئێوارەکەی، وەك ئەمەریکاییەکان خەوم نەهات، چونکە ئەوان زۆر دەخۆن لە خوانی سانکسگیڤینگ و دواتریش خەویان دێ، من چوومە سەر کەناری سانتا مۆنیکا. رۆژی دواتر چوومە هۆلیوود و تێر سووڕامەوە. رۆژی دواتر تێر سوپاسی جیجیم کرد و هوتێلەکەم بەجێهێشت و چوومە باڵەفڕگە و لەوێوە بۆ سانفرانسیسکۆ.

★★★

ئێوارەکەی گەیشتمە سانفرانسیسکۆ و خێرا دوای چێك ئین لە هوتێل چوومە سەر پردی زێڕین. گەشتەوەرێکی ئێجگار زۆری لێ بوو.

"بێ زەحمەت دەتوانی وێنەیەکمان بگری؟" کەپڵێك لە ناوەڕاستی سییەکان داوایان لێ کردم.

"بێگومان،" دڵنیام کردنەوە و دواتر گوتم، "ئێرە باش نییە، وەرنە ئەولاتر بۆ ئەوەی پردەکە جوانتر بەدیار بکەوێ و دەربچێ."

"بەڕێز جەنابتان فەڕەنسین،" پیاوەکە پرسی.

"نەخێر، من خەڵکی کوردستانی عێراقم،" بەپێکەنینەوە گوتم.

پیاوەکە یەکسەر کردییە کوردی! چاك و چۆنیمان کرد و کەوتینە قسە. دواتر دوو وێنەم بۆ گرتن. دوای ئەوە تەواو یەکتریمان ناسی و ئەوان خەڵکی کوردستانی ئێران بوون، بەڵام دانیشتووی کەنەدا بوون. منیش پێم گوتن کە خەڵکی هەولێرم و لە ئەمەریکا ماستەر دەخوێنم لە ڕۆژنامەوانی.

"چۆن لە ئەمەریکا گەیشتووی تا ئێستە؟" پیاوەکە پرسی.

"ئەمەریکا وڵاتێکی گەورەیە، خەڵکەکەی ئێجگار باش و ئێجگاری خراپیشی تێدایە." گوتم.

"هەمووی راکە راکیانە وانییە؟" ئەو گوتی.

"بەڵێ، ئەوەش سیستمەکە وای لێکردوون کە بەس خەریکی ئیشکردن بن." گوتم. "ئەی ئێوە چۆن لە ئەمەریکا گەیشتوون؟"

"ئەمەریکا باشترین و خراپترین وڵات و گەلە لەسەر ڕووی زەوی،" ئەو بەزەردەخەنەوە گوتی.

"چۆن، مەبەستت چییە،" من عادەتی خۆم پرسیم و ویستم بزانم چۆن لە ئەمەریکا گەیشتووە.

"لە هەندێ شت زۆر خراپن و لە هەندێ شت زۆر باشن،" پیاوەکە وای گوت. "لە ڕووی سیاسەتەوە تەنێ بەرژەوەندیی خۆیان دەوێ، گرینگ نییە با هەموو دنیا وێران بێ، بەڵام بەرژەوەندیی خۆیان بپارێزن. ئەمەیان زۆر خراپە. زۆر باشن بۆ لەناوبردنی دیکتاتۆران، بۆ نموونە سەدامیان رووخاند، قەزافیان ترساند و وازی لە چەکی ئەتۆمی هێنا، رژێمی دواکەتوو و کەللەپوچی تالیبانیان رووخاند. ئەگەر بێو و ئێران و سوریاش بگۆڕن ئەوا هەر زۆر باشە."

"ڕاست دەکەی،" گوتم. "ئەی خەڵکەکەی چۆنە؟"

"گەلی ئەمەریکا گەلێکی بێ زانیارییە،" پیاوەکە بەردەوام بوو. "لە کاری ڕۆژانەی و ماڵ و بارِ و شوێنی کار بترازێ ئاگایان لە هیچی دنیا نییە. هیچ زانیارییەك لەسەر دنیای دەرەوەی خۆیان نازانن. بەڵام خەڵکی باشن، من زۆر برادەری ئەمەریکاییم هەیە، هەموویان کوڕی باشن و یارمەتیدەرن."

لەو قسانەدا بووین، باران دەستی پێکرد. ئیتر یەکتریمان بەجێ هێشت و من سواری پاس بووم و چوومە گەڕەگی هایت و ئاشبێری. گەڕەکی هیپییەکان بوو لە ساڵانی شەست و حەفتاکان. تێر سووڕامەوە لەو دوو شەقامە.

لە کۆتاییی شەقامی هایت بەلای باکوور پارکی گۆڵدن گێیت هەیە. پەڕیمەوە لە شەقامەکە و دواتر لە بەرزاییەکە شۆڕ بوومەوە. لەوێوە، تاکە دەروازە تونێلێکی دە مەتری بوو بەرەو پارکەکە. لە تونێلەکە نێزیك بوومەوە، بینیم پڕە لە بێ ماڵ و دایعەکان. لەبەرئەوەی کەشوهەوا کەمێك سارد بوو، ئەو ناوە کەسی لێ نەبوو. گومانی ئەوەم لا دروست بوو کە ئەگەر بەوێدا تێپەڕ بم ڕەنگە ڕێم لێ بگرن و تووشی گێچەڵێکم بکەن. گومانەکەم ڕاست دەرچوو، هەر ئەوەش ڕووی دا. کاتێ بەوێدا تێپەڕیم، لە ناوەڕاستی تونێلەکە، یەکێکیان دەستی گرتم و داوای پارەی لێ کردم.

تەماشایەکی دەوروبەرم کرد و بینیم نێزیکەی ١٢ کەس دەبوون و چوار سەگیشیان پێ بوو. دەستم ڕاپچکاند و تا هێزم هەبوو پاڵێکم پێوە ناو و تێم تەقاند. تف . . . ڕاکە. چوار کەسیان بەدووام کەوتن. من زۆر خێرا ڕام دەکرد، نێزیکەی دوو سەت مەتر بەدوام کەوتن بەڵام زانیان نامگەنێ، وازیان هێنا. من گەیشتمە ناو پارکەکە و لە شوێنێك دانیشتم تا ماندووم حەسایەوە.

تێر بەناو پارکەکەدا سوڕامەوە و دواتر بەشوێنی خۆمدا نەگەڕامەوە. سواری پاس بووم و گەڕامەوە شەقامی مارکت کە شەقامێکی دوور و درێژ و قەرەباڵغ و زۆر خۆشە.

★★★

تووشی گێچەڵێکی تریش بووم لە سانفرانسیسکۆ. کاتێ چوومە باڵەفڕگە، ئەفسەری چێك ئین باوەڕی بە ناسنامەی کانزەسم نەکرد. من نازانم بۆچی، بەڵام داوای پاسپۆرتی لێکردم. منیش پاسپۆرتم لە جانتاکەم دەرهێنا و دامێ. هەرکە تەماشای کرد پاسپۆرتی عێراقییە، گوتی لادە ئەولایە و بانگی ئەفسەری سەرپەرشتیاری کرد.

لێرەدا، قسەی برادەرەکەم بەبیر هاتەوە کە هەموو جار دەیگوت پاسپۆرتی عێراقی زۆر بێ نرخ و بێهێزە. ئەو هەردەم دەیگوت حەز دەکەم پاسپۆرتی ئەمەریکاییام هەبێ، چونکە کەس یەخەت ناگرێ لە باڵەفڕگەکانی دنیا، کێوە دەچی برۆ. هەرچی بەلامدا تێدەپەڕی تەماشای دەکردم، وەك بڵێی من تاوانبار یان تیرۆریست بم. زۆرم پێناخۆش بوو. هێندەی نەبرد، ئەفسەری سەرپەرشیتیار هات و کۆمەڵێك پرسیاری لێکردم. دواتر داوای ناسنامەیەکی تر و کرێدیت بانکی کردم. هەمووانی پێکەوە دانا و دڵنیای کردەوە کە گرفتیان نییە. دواتر ناسنامە و پاسپۆرتەکەی دامەوە و گوتی دەتوانی برۆی.

هەموو ئەمانەی سەرەوە وەڵامی کاتاکی هاورێم بوو کاتێ لە ناو پاس لێی پرسیم چیت کرد بۆ سانکسگیڤینگ. بەتەواوبوونی سەربردەکەم، پاسەکەم گەیشتە شوێنی مەبەست و کاتاکیم بەجێ هێشت و چوومەوە ماڵ.

★★★

"کازیار"م لە شیکاگۆ ناسی. گەنجێکی زیرەك بوو و گفتوگۆیەکی باشمان کرد لەبارەی زۆر شت. کازیار خەڵکی شیکاگۆ بوو و زۆر کەیفی بەئۆباماى سەرۆکی ئەمەریکا دەهات. قوتابیی دکتۆرا بوو و دەربارەی شتەکان وردبوونەوەی باشی هەبوو. بۆچوونی لەسەر سیستمی پەروەردە لە ئەمەریکا زۆر سەرنجی منی راکێشا.

"رات چییە لەسەر سیستمی پەروەردەی ئەمەریکا؟" پرسیم.

## ١٣

# شیکاگۆ

کامیرەکەمی برد و هەڵات. دەمە و خۆرئاوابوون بوو. کامیرەکەم لەسەر بەردێك دانابوو بۆ وێنەگرتنی خۆرئاوابوون و چۆنیەتی داگیرساندنی گڵۆپەکانی ئەو پۆلە هەوربڕەی شیکاگۆ. لەبەردەمی مۆزەخانەی پلانتاریەم، ڕێك بەرامبەر پۆلە هەوربڕەکە کامیرەکەم دانابوو. خۆیشم لە خوارەوە پشتم لە کامیرەکەم بوو و ڕووم لە خۆرئاوابوون و پۆلە باڵەخانە هەوربڕەکە بوو. قەت بیرم بۆ ئەوە نەچووبوو یەکێ کامیرەکەم ببا و هەڵێ. ئێمە هەموو جار دەڵێین ئەمەریکا وەك سعودیە سەلامەتە بۆ شت دزین، بێگومان ئەمە بەگاڵتە وا دەڵێین، چونکە تەنانەت لە سعودیەش دزیکردن هەر هەیە و هەرچەندە کەعبەی موسلمانانیشی لێیە.

ئاوڕم داوە کامیرەکەم نەمابوو، هەتا من چوومە سەرەوە ئەو تێێ تەقاندبوو. دانیشتم و زۆر بێ تاقەت بووم بۆ کامیرەکەم، چونکە هەموو وێنەکانی گەشتی شیکاگۆمی تێدابوو. لەسەر هەمان ئەو بەردە دانیشتم کە کامیرەکەم لەسەری ڕاگرتبوو، دۆش دامام بەرامبەر پۆلە هەوربڕەکە. خۆریش هێدی هێدی سەری ئاوا دەکرد. دوای ماوەیەك خەم و سوو لە کامیرەکەم، یەك بەخۆم پێکەنیم. پێکەنینەکەم لووتکەی بێ تاقەتیم بووم.

بیرم لەوە دەکردەوە دەبێ ئەو کەسە کامیرەی منی بۆچی بێ. دواتر هەر خۆم بەخۆم دەگوت، کامیرەکەم نێزیکەی دووسەت دۆلار دەکا، لەوانەیە بەشی هەفتەیەکی بکات.

وێڕای ئەوەی زۆر بیرم لەلای کامیرەکەم بوو، شەپۆڵی دەریا و دیمەنی داگیرسانی گڵۆپەکانی پۆلە هەوربڕەکە و خۆرئاوابوون ئەوپەڕی چێژیان پێ بەخشیم. دەتوانم بڵێم هەرسێکیان پێکەوە، شەپۆڵی دەریا و هەوربڕەکان و خۆرئاوابوون بوون بەخەمڕەوێنی

من بۆ کامیرەکەم. خەڵك پێدا پێدا بەرەو ماڵ شۆڕ دەبووەوە و ئەو ناوە بەرەو چۆڵ بوون دەچوو. تا وای لێهات تاك و تەرا، لێرە و لەوێ چەند کەسێك هامشۆیان بوو.

دایك و باوکێك لەگەڵ منداڵێکی سێ ساڵە بەوێدا تێپەڕین. سیمای منداڵەکە زۆر لە لۆهانی کوڕم دەچوو. ئیتر سوێی غەریبی و سووی کامیرەکە تێکەڵ بەیەکتر بوون. بیرم لەوە دەکردەوە، ئەو ئەزموونەی من لە ئەمەریکا چەند خۆشتر و بەسوودتر دەبوو ئەگەر ماڵ ومنداڵیشم لەگەڵ بوایە. تا ونبوون لەبەرچاوم، بیرم هەر لای لۆهان بوو.

بەلەمێکی بچووك بەئاوەکەدا تێپەڕی، بەو بەلەمە گەشتی خۆم و خێزانەکەم بەبیر هاتەوە بۆ ڤێنیس کاتێ بە لوگنا بەنێو کۆڵانە ئاوییە تەسك و باریکەکانی ڤێنسدا سووڕاینەوە. کابرایەکە گۆرانییەکی شێوە ئۆپێرای بۆ ئێمە دەچڕی و نم نم بارانیش دەباری. خۆشترین گەشتم لە ژیانمدا، ئەو گەشتە بوو لەگەڵ خێزانم. تا بەلەمەکە تێپەڕی بیرم هەر لای خێزانم بوو لە ڤێنیس.

دواتر ژن و پیاوێك کە وێدەچوو لە تەمەنی ٥٠ ساڵی بەسەرەوە بن، بەوێدا تێپەڕین. دایك و باوکم بەبیر هاتەوە. لە ژیانم بەردەوام حەز دەکەم گەشتێك بەدایك و باوکم بکەم. حەز دەکەم بیانبێرم بۆ حەج. بیرم لەوە دەکردەوە داخۆ دەبێ چۆن بن لەگەڵ شەکرەکەیان. ئیتر تا ئەوانیش تێپەڕین بیرم لە لای دایك و باوکم بوو.

★★★

"ئەم کامیرە هی تۆیە؟" یەکێك بەرەو ڕووم هات و کامیرەکەمی لەدەستدا بوو و پرسیاری کرد.

بەو پرسیارە منی پچڕاند لە بیرکردنەوەکانم. کاتێ کامیرەکەم بینی تاسام. سەروسیمای بەدزان نەدەچوو و گەنجێکی ماقووڵ دیار بوو. چ وێنەدەچوو ئەو کامیرەکەمی بردبێ لە نیوەی ڕێ پەشیمان بووبێتەوە.

تەماشای کامیرەکەم کرد و گوتم، "بەڵێ، ئە. . .ئەوە چۆن . . ."

هات لە تەنیشتم دانیشت و دەستی ڕاستی بۆ تۆقەکردن هێنا و گوتی، "من کازیارم."

" گۆرانم،" تۆقەم کرد و گوتم. "خۆشحالّم."

هەردووکمان پێکەوە سەیری دواهەمین تاتکێی خۆرمان کرد تا ئاوا بوو. ئیتر ئەو ناوە تاریك بوو و کەسی لێ نەما.

"کامیرەکەمی منت لە کوێ دۆزییەوە؟" من پرسیارم کرد بەدەم تەماشاکردنی پۆلە هەوربڕەکە کە شەوقیان ئاسمانی تاریکی ڕووناك دەکردەوە.

"کاتێ کوڕەکە کامیرەکەی برد، من لێی نێزیك بووم لە پشتەوە،" کازیار گوتی. "من لە دواوەی تۆ وێنەم دەگرت و خەریکی تەسویرکردن بووم. کە کامیرەکەی رفاند من بەدوای کەوتم و کامیرەکەم لێ وەرگرتەوە. زانیم تۆ پێڕاناگەی بەدوای کەوی."

"ئۆه، زۆر سوپاس، دەینرخێنم،" من بەزەردەخەنە و کەیف خۆشییەوە گوتم.

دوای ئەوە کەوتینە یەکترناساندن و هەریەکە بەنۆرە باسی خۆمان بۆ یەکتری کرد. ئەو زۆری پێخۆش بوو کاتێ زانی من خەڵکی کوردستانی عێراقم. زۆر پرسیاری لەبارەی جیاوازیی نێوان کورد و عەرەب کرد و منیش زۆر بەباشی بۆم شیکردنەوە.

"کورد و عەرەب گرفتیان نییە لەسەر شەقام، پێکەوە زۆر ئاسایی دەژین،" من گوتم. "بەڵام پرسە سیاسییەکان زۆرجار ناکۆکی و رق و کینە دەخاتە نێوان هەردوو گەلەوە. ئەو تاوانانەی ڕێژیمەکانی عێراق بەرامبەر بەگەلی کوردیان کردووە زۆرن. لە ١٩٨٨ بەگازی ژەهراوی لە هێرشێکدا ٥ هەزار کوردی کوشت سەدام حوسێن. لە شاڵاوی ئەنفال ١٨٢ هەزار کوردی بێ سەر و شوێن کرد. هەموو ئەمانە لە ناخی تاکی کورددا رەش نابنەوە."

زۆر باش گوێی لە قسەکانی من گرتبوو و زۆر تێنووی زانیاری بوو. منیش پێدا پێدا هەموو شتێکم بۆ شیکردەوە.

"وێڕای هەموو ئەو نەهامەتییەی کورد بەدەستی عێراقەوە بینی ئێستە کورد دوای ٢٠٠٣ بەشدارە لە یارمەتیدانی عەرەبەکان و دروستکردنەوەی عێراقێکی دیموکرات و فیدرال،" بەردەوام بووم. "کورد بەهەموو شتێك ئامادەیە بۆ

دروستکردنەوەی عێراق، تەنانەت هێزەکانی ئاسایشی لە شارەکانی تری عێراقیش یارمەتی حکوومەتی عێراقی دەدەن بۆ هێورکردنەوە و سەقامگیرکردنی وڵات."

"بەڕاستی سەرسامم بەهەڵوێستی کورد،" حەپەسانی خۆی دەربڕی. دواتر بەردەوام بوو و گوتی "ئێستە زۆر تاریك داهات بڕۆین باشە."

ئیتر بەڕۆیشتن تا بەردەمی هوتیلەکە هات.

"سیستمی پەروەردە لە ئەمەریکا چۆنە؟" بەدەم ڕۆیشتنەوە من پرسیارم لێ کرد.

"سیستمی خوێندن و پەروەردە لە ئەمەریکا زۆر لاوازە!"

"چۆن؟" من پرسیم، "هەموو دنیا دەیەوێ بێ لە ئەمەریکا خوێندن تەواو بکات. مەبەستت چییە؟"

زەردەخەنەیەکی هاتێ و بەدەست منی لەسەر شەقامەکە لادا و بۆ ئەوەی نەکەومە چاڵێك کە لە بەردەممان بوو.

"خوێندن لێرە زۆر سەرئاوییە،" بەردەوام بوو. "قووڵ نابنەوە بەناو بابەتەکاندا، بۆیە نەوەی نوێی ئەمەریکایی زۆر بێ زانیارییە."

"قەت باوەڕ بەمە ناکەم،" من مشتومڕم کرد. "ئێمە لە ڕۆهەڵات وا تێگەیشتووین کە ئەمەریکا باشترین سیستمی خوێندنی هەیە."

"نا وا نییە، لە زۆر وڵاتی تر خوێندن زۆر قووڵە و باشترە لێرە،" کازیار سوور بوو. "لایەنە باشەکانی خوێندن لێرە ئەوەیە کە هەموو شتێك بەردەستە. زانیاری، کتێب، ئینتەرنێت، تاد. بەڵام لە زۆر وڵات هەیە سیستمەکەیان باشە بەڵام سەرچاوەیان نییە، هێڵی ئینتەرنێتیان نییە یان لاوازە، کتێبخانەیان نییە."

" مەگەر ئەمانە بەشێك نین لە سیستمی خوێندن،" بە تەوسێکەوە گوتم. "بێگومان ئەگەر ئەوانە نەبێ واتە سیستمی خوێندن لاوازە، بۆ نموونە چی دەکەی ئەگەر سەرچاوەت نەبێ."

"ڕاست دەکەی بەڵام قوتابی قووڵ نابێتەوە لە خوێندن،" کازیار گوتی.

"کەواتە بار لە ملی قوتابییانە،" من گوتم. "ئەوان ناخوێنن ئەگینا سیستمەکە باشە. بۆ نموونە لێرە پێوەندیی نێوان قوتابی و مامۆستا زۆر باشە، قوتابی زۆر مافی

هەیە و هەموو شتێکی لەبەردەستە بۆ بەدواداچوون. بەڵام ئەگەر نەیکات ئەوا خۆی بەرپرسیارە نەك سیستمەکە."

"راست دەکەی، ئەریٚ بۆ پێوەندیی نێوان قوتابی و مامۆستا لە لای ئێوە باش نییە؟" ئەو پرسی.

"ئەم هەویرە ئاو زۆر هەڵدەگریٚ،" هەناسەیەکم هەڵمژی و دایەوە و گوتم. "لەسەر ئاستی تاك هەیە. هەندیٚ مامۆستا هەنە دەبن بەهاوریٚ و جیٚ متمانەی قوتبایانن و بەم شێوەیەش قوتابییەك باشتر وانەکەی لیٚ وەردەگریٚ. بەڵام زۆربەی مامۆستاکان وەك خوداوەند مامەڵە دەکەن لەگەڵ قوتابیان. مامۆستا خۆی بەپاشا و قوتابی بەخزمەتکار دەزانیٚ."

★★★

لەو قسانەدا بووین گەیشتینە بەردەم هوتیلەکەی من. لەویٚ دەمێك پێکەوە راوەستاین و بابەتەکەم پچڕا لەبارەی پەروەردە. بەدەم وەستانەوە، هاتینە سەر پرسە کۆمەڵایەتییەکان. من باسی خۆیم بۆ کرد کە خێزان و کوڕێکیشم هەیە. ئەویش باسی سەربردەی خۆی بۆ من گێڕایەوە کە چۆن کەوتووەتە داوی خۆشەویستی کچێکەوە و تا ئێستە هەوڵی بۆ دەدا. لەبەرنەبوونی کات، نەمانتوانی درێژە بەگفتوگۆکەمان بدەین. بۆیە هیوای سەرکەوتنم بۆ خواست و ژمارەی تەلەفۆن و ئیمەیل و فەیسبووکمان گۆڕییەوە و یەکتریمان بەجیٚ هێشت.

★★★

رازینی هاوڕێم کچێکی باڵا مامناوەند و باریك و چاو شین بوو. قژی مەیلە و زەرد بوو. شێوەی لە ئەکتەری بەناوبانگ کێیت وینسلێت دەکرد. بەلای من کچێکی زۆر سەرنجڕاکێش بوو. زۆر کەیفم بەهاوڕێیەتی ئەو دەهات، چونکە مگێز و چەشەی لەگەڵ من دەهاتەوە. جۆری من بوو بۆ هاوڕێیەتی. رۆژێك لە کتێبخانە دوای تەواوکردنی خوێندن، هاتە بن گوێم و دەستی بەقسان کرد.

"بۆچی منت ناسی؟" دوای کۆمەڵێك رستەی تر ئەم پرسیارەی بەگوێمدا چرپاند.

## ١٤

# موجیزەی کتێبخانە

ماوەی چوار مانگ تەنێ تەماشای یەکترمان کرد. ڕۆژانە پێنج تا ١٥ خولەك تەماشای یەکترمان دەکرد لەکاتی خوێندنەوە و خوێندن لە کتێبخانەی ئۆنشوتز. هیچ ڕۆژێك قسەمان لەگەڵ یەکتری نەکرد. سڵاویشمان لەیەکتر نەدەکرد. هەموو ڕۆژ لەسەر یەك مێز دادەنیشتین و پێش هەموو شتێك دەستمان دەکرد بەخوێندن، دواتر لە هافتایم تەماشاکردن دەستی پێ دەکرد. وەك بلێی بوو بوو بەیاسا، کە نەدەبوایە لە کاتی خوێندن کەس تەماشای ئەوی تر بکا، بۆیە هەردووکمان ڕێزمان لەو یاسایە دەگرت.

بەچاو یەکتریمان باش دەناسی. من دەمزانی بەیانی ئەو چ جلێك لەبەر دەکا، چ پێڵاوێك، چ چاکەتێك، چ پێنووسێك لەگەڵ خۆی دێنێت، چ پانتۆڵێك. نەك هەر ئەوە، تەنانەت ڕەنگەکانیشم پێش وەختە دەزانی. ئەویش بەهەمان شێوەی من بوو. دەیزانی چەند کراسم هەیە، کام ڕۆژ کامە کراس لەگەڵ کامە پانتۆڵ لەبەردەکەم. بێ ئەوەی قسە لەگەڵ یەکتر بکەین، بیری یەکتریمان دەخوێندەوە. من دەمزانی ئەو حەزی لە چییە و رقی لە چی دەبێتەوە. دەمزانی کەی دەڕوا، کەی دێ. وا شارەزای بووبووم، دەمزانی کەی بەجدی دەخوێنێ و کەی بەگاڵتە کتێب دەگرێ بەدەستەوە. دەمزانی کەی تاقیکردنەوەی هەیە، کەی سترێسی زۆر لەسەرە.

★★★

کە بۆ یەکەم جار چوومە کتێبخانەی ئۆنشوتز، ئەو ڕۆژە زۆر قەرەباڵغ بوو. لەبەر نەبوونی جێگە، خەڵك لەسەر زەوی دانیشتبوون دەیانخوێندەوە. کتێبخانەکە جمەی لێوە دەهات. بەناو هۆڵەکەدا دەگەڕام بەدوای شوێنێك. ئەمسەر و ئەوسەرم کرد هیچ

شوێنم دەست نەکەوت، تەنانەت لەسەر زەویش. بەڵام لە پەنا دینگەیەك مێزێکم بینی گەورە، کورسیەکی بەتاڵی لەگەڵدا بوو. پێنجەم کورسی کچێك لەسەری دانیشتبوو و خەریکی خوێندن بوو. وامزانی کورسییەکانی تر گیراوە و ئەوانی تر دەرچوونە و دەگەڕێنەوە. ماوەی پێنج دەقە چاوەڕێم کرد، کەس نەگەڕایەوە سەر کورسییەکان. جانتا، کاغەز، لاپتۆپ هیچم نەبینی لەسەر ئەو کورسیانە، واتە هیچ نیشانەك نەبوو پێم بڵێ گیراون. نەمویست بیپچڕێنم لە خوێندن، بۆیە فرەیەکی ترم لێدا بەنیازی دۆزینەوەی شوێنێك، بەڵام هیچ شوێنێکی بەتاڵ لەو کتێبخانە گەورە نەبوو. ناچار گەڕامەوە سەر هەمان مێز کە کچێك بەتاقی تەنیا لەسەری دانیشتبوو. کورسییەکەی تریش هەر چۆڵ بوو.

"ئەم کورسییە گیراوە؟" بەهێمنی پرسیم بۆ ئەوەی سەری نەیەشێنم و لەوانی چواردەوریش تێك نەدەم.

ماوەی ١٠ چرکە وەستام، هیچ وەڵامی نەدامەوە. سەری لەسەر کتێبەکەش هەڵنەگرت. نەبای بوو نە باران، هەر هەستیشی نەکرد یەکێك پرسیاری لێ دەکا. بۆ ماوەیەك وامزانی لەخۆچووە، چونکە هەناسەشی نەدەدا. دواتر کتێبەکەی داخست و کتێبێکی تر لە جانتاکەی دەرهێنا. چاوی هەڵنەدەبڕی  بۆ ئەوەی بمبینێ لەوێ وەستاوم.

"بێ زەحمەت کەس لەسەر ئەو کورسییە دادەنیشێت؟" من دووبارە پرسیم و کەمێك دەنگم هەڵبڕی و زیاتر لێی چوومە پێشەوە.

ماوەی چەند چرکەیەك وەستام، هەمان شت. نە تەماشای کردم، نە وەڵامی دامەوە، نە هەستیشی پێکردم کە لەوێ وەستاوم. تەماشای دەوروبەرم کرد، هەموو قوتابییەکانی تر تەماشای منیان دەکرد و دەخەنینەوە. منیش هەستم بەشەرمەزاری کرد و کەمێك کشامەوە. نەمزانی بەچی پێدەکەنن، چونکە هیچ هەڵەیەکم نەکرد بوو و هیچیشم بەخۆم شك نەدەهات. تەماشای جلوبەرگم کرد، هیچ عەیبێکیان نەبوو. بۆیە ناچار چوومە لای پرسگە.

"مێزێك لە پەنا ئەو دینگەیە، کەوتووەتە ئەو گۆشەیەی کۆتاییی، دوو کورسی لەسەرە، یەکێکیان کچێك لەسەری دانیشتووە و ئەوی تریش بەتاڵە. هەرچەندی دەپرسم، کچەکە وەڵام ناداتەوە. دەتوانم لەسەری دانیشم؟"

کچەکەی پرسگە پێکەنی و گوتی، "ئەها، واز لەو کورسییە بێنە، چونکە ئەو کچە تۆزێك گرفتی هەیە."

"چ جۆرە گرفتێك، بۆ کەس نابێ لەسەر ئەو کورسییە دانیشێت . . . سەیرە؟" پرسیم.

"بەڕاستی نە من و نە کەسیش دەزانێ، بەڵام زۆرجار هەوڵیان داوە لەسەری دابنیشن، بەڵام دەستی کردووە بەگریان و هەرا. بۆیە هەموومان وازمان لەو کورسییە هێناوە."

"سەیرە!"

من بەو قسانەی کچەکەی پرسگە تاسام. چوومەوە لای مێزەکە. لە تەنیشت کورسییەکە لەسەر زەوی بەرامبەر بەکچەکە دانیشتم. لاپتۆپەکەم لە جانتا دەرهێنا و وایەرەکەم خستە ئەو سویچەی کە لاپتۆپی کچەکەشی لەسەر بوو. لاپتۆپەکەم کردەوە، بەڵام راستییەکەی تەماشای لاپتۆپەکەم نەدەکرد، بەڵکو لە رێگەی لاپتۆپەکەم تەماشای ئەوم دەکرد. لاپتۆپەکە ببوە هۆکار، ئەو هەستی بە من نەدەکرد کە تەماشای دەکەم.

تا سەعات ١٠ی شەو، هەر لە بەرامبەری دانیشتم. ئەو کچە چاوی هەڵنەبڕی و هەر خەریکی خوێندن و لاپتۆپەکەی بوو. دەموچاوی گرژ بوو، زانیم کە گرفتەکەی گەورەیە. کورسی تر چۆڵ بووبوون، بەڵام من هەڵنەستام لە شوێنی خۆم. زۆر حەزم دەکرد بزانم گرفتی ئەو کچە چییە. سەعات دە کەمێك لای دابوو، خۆی خڕ کردەوە و رۆیشت.

کە ئەو رۆیشت، من چووم لە جێگەکەی ئەو دانیشتم. کەوتمە بیرکردنەوە لەو کچە.

"دەبێ چی وای لەو کچە کردبێ، ئاوا پەراوێز و تەنیا بژی؟" بیرم کردەوە و لەخۆم پرسی. "باشە بۆ کەس گرفتی ئەو نازانێ، دەبێ ئەوەندە دڕندە بێ کەس نەیوێرا بێ قسەی لەگەڵ بکا، یانیش کەس نەیویستووە یارمەتی بدا."

رۆژی دواتر سەعات یەك چوومە كتێبخانە. یەكسەر چوومە لای مێزە پەراوێزەكە و كچەكە هێشتا نەهات بوو. منیش چووم لەبەرامبەر شوێنەكەی ئەو دانیشتم. لاپتۆپەكەم دامەزراند و دەستم كرد بەخوێندن. سەعات دوو هات. هەرچی لە چواردەرمان بوو، تەماشای ئێمەی دەكرد. وك بڵێی چاوەڕێی بەرتەكی كچەكەیان دەكرد بەرامبەر بە من. من پێشێلی یاسام كرد بوو. نەدەبووایە كەس لەسەر ئەو كورسییە دانیشێت.

لاپتۆپ و كتێب و چەند كاغەزێكی دەرهێنا لە جانتاكەی و دانیشت. بێ ئەوەی تەماشام بكە، دەستی كرد بەخوێندن. دڵم هێوربووەوە، چونكە هیچی نەكرد.

"زۆر سوپاس رێگەت بەمندا لەسەر ئەم كورسییە دانیشم،" دوای چارەگە سەعاتێك ئەوەم پێ گوت.

هیچ وەڵامی نەدامەوە. ئەوانەی چواردەوریشمان بێ ئومێد بوون، چونكە زانیان كە هیچ بەرتەكێكی نییە و ئیتر هەر كەسە و خەریكی خوێندنی خۆی بوو.

هەستام چوومە ئاودەست. هێندەی نەبرد یەكێكی تر هات و لە كاتی مێزكردندا گوتی، "دەزانی تۆ شانست هەیە ئەو كورسیەت بەركەوت. پێشتر ئەوەی لەسەری دانیشتبا، ئەو كچە دەیكرد بە هەرا و دەگریا تا كەسەكە هەڵدەستا لە بەرامبەری و دواتریش كڕ دەبووەوە. ماوەی ساڵێكە ئەو بەزمە بەردەوامە. بەڵام زۆر سەیرە بۆ تۆ هیچی نەكرد."

چوومەوە جێگەكەی خۆم. بیرم لە قسەی ئەو كوڕە كردەوە لە ئاودەست وای گوت. بیرم لە نهێنی ئەو كچە دەكردەوە. ئیتر هەموو رۆژ هەمان شت دووبارە بووەوە. من رۆژانە سەعات یەك دەچووم، بۆ ئەوەی پێش ئەو بچم لەوێ دانیشم. وردە وردە ئەویش چاوی هەڵدەبڕی، تا وای لێهات، ئەویش تەماشای منی دەكرد. بەڵام هەرچ پرسیارێكم دەكرد وەڵامی نەدەدایەوە. دوای ماوەیەك وازم هێنا لە پرسیارەكان و تەنێ ماوەی پشووەكان تەماشای یەكتریمان دەكرد. ماوەی چوار مانگ ئەمە بەردەوام بوو. شەوێك زۆر بیرم كردەوە تا گەیشتمە پلانێك بۆ بەقسەهێنانی ئەو كچە.

ڕۆژی دواتر کە ئەو هات دانیشت و ئیتر من دەستم کرد بەقسە و گوتم، "دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم . . . من سەرسامم بەتۆ . . . کەیفم بە تۆ دێ . . . کەیفم بەهەموو شتێکی تۆ دێ."

چەند چرکەیەك بێ دەنگ بوو. دواتر چاوەکانی هەڵبڕی، پڕبوون لە فرمێسك. دەستی کرد بە گریانێکی هێمن.

ماوەی دو دەقە گریا و گوتی، "تکایە ئەوەی گوتت دووبارەی بکەوە!."

ئەوە یەکەم قسەی ئەو بوو دوای چوار مانگ تەماشاکردنی یەکتر. تەماشایەکی چواردەورم کرد، ئەوانیش وەك من هەموویان تاسا بوون، کە چۆن ئەو کچە دەستی بە قسان کرد. هەموویان پێیان خۆش بوو کە من توانیم ئەو کچە بێنمە گۆ.

" من سەرسامم بە تۆ . . . کەیفم بە تۆ دێ . . . کەیفم بە هەموو شتێکی تۆ دێ."

کە ئەوەم دووبارە کردەوە، گریانەکەی زیاتر بوو. لاپتۆپەکەی داخست، کتێبەکەی پێوە دا. هەنیشکەکانی خستە سەر مێزەکە و تەماشای کردم.

"کێ ئەمەی فێر کردی؟" پرسی.

"کێ چی فێر کردم؟" بە تاسانەوە گوتم.

"ئەو قسانەی بە منت گوت، کێ فێری کردی؟" پرسی.

"ئەوە باسی چی دەکەی، تێناگەم."

هەردووکمان بێ قسە بۆ ماوەیەك تەماشای یەکتریمان کرد. دواتر کلینیکسێکم دایێ بۆ ئەوەی فرمێسکەکانی بسڕێتەوە. یەك دوو هەناسەی قووڵی هەڵکێشا و زەردەخەنەیەکی هاتێ. من زۆر سەرسام بووم بەوە.

"دەکرێ بزانم چیرۆکی تۆ چییە، ئەرێ بەڕاست من گۆڕانم،" بە زەردەخنەوە گوتم.

"من رازینم!" دەستی هێنا بۆ تۆقەکردن.

بۆ ماوەی دوو خولەك دەستی یەکتریمان راهەژاند. بەدەم تۆقەکردنەوە، تەماشای یەکتریمان کرد و پێدەکەنین.

"بۆیفرێندێکم هەبوو، بەڵام لە شەڕی عێراق کوژرا،" ئەو بە دڵساردی گوتی.

"بەڕاستی! بەداخەوە، ئەریٚ بەڕاست من خەڵکی کوردستانی عێراقم."

"ئەها، ئەو زۆرجار لە تەلەفۆن باسی دەکرد، چونکە چەند جارێك چوو بووە کوردستان،" رازین وای گوت.

"چۆن باسی کوردستانی دەکرد؟" بە پەرۆشەوە پرسیم.

"بە باشە، حەزی لە کوردستان بوو، چونکە دەیگو سەلامەتە،" بەردەوام بوو. "لە فەلووجە کوژرا. هەموو جار باسی دڕندایەتیی تیرۆریستەکانی دەکرد، تا دواتر خۆی بەر تەقینەوەیەك کەوت."

ئەوەی گوت و دەستی کرد بە گریان. من هەوڵمدا دڵنەوایی بدەمەوە.

"کەیفی بە سەربازی نەدەهات، بەڵام پارەی نەبوو بچێتە کۆلێژ، بۆیە بووە سەرباز بۆ ئەوەی خەرجی کۆلێژ دەربێنێت. زۆر سەیرە کە تۆ ئەو قسانەت بە من گوت. ئەویش یەکەم جار هەمان ئەو قسانەی بە من گوت و دواتر بووینە هاوڕێ."

"بە داخەوە، چۆن ئەم قسانەی پیٚ گۆتی، سەیرە من هەمان قسەی ئەوم دووبارە کردەوە." سەرم سڕما.

"سەربردەکەمان زۆر خۆشە،" رازین گوتی. "هەڵسوکەوتی تۆ زۆر لەو دەچوو، هەر بۆیەش رێگەم پێدای دانیشی لەسەر ئەو کورسییە."

"ئەها، چۆن دەتوانی پێم بلێی،" کەمێك لێی چوومە پێش.

"ماوەیەکی زۆر بەدوامەوە بوو. قەت قسەی نەدەکرد. زیاتر لە شەش مانگ رۆژانە لە کاتی چاوەڕوانکردنی پاس لەبەردەم هۆڵی مالکۆڵم ئێمە تەماشای یەکتریمان دەکرد تا پاس دەهات. ئەو نەدەهاتە پێش خۆی بناسێنێت و منیش خۆم لەگێلی دەدا."

لاپتۆپەکەم داخست و زیاتر نێزیك بوومەوە لێی تا باش گوێی لیٚ بگرم.

"رۆژێك لە پاس هاتمە خوار، ئەویش لەگەڵ من هاتە خوار،" بەردەوام بوو. "دەمزانی ئەوە رێگەی ئەو نەبوو. هێندەی نەبرد پێش ئەوەی بچمە هۆڵی مالڤین، گوتی بیٚ زەحمەت . . .،" ئاوڕم داوە ئەو بوو.

رازین لەو قسانەدا زەردەخەیەکی هات و دواتر هەناسەیەکی هەڵکێشا و ئەوجار گوتی، "هاتە پێش و گوتی:
من سەرسامم بە تۆ . . . کەیفم بە تۆ دێ . . . کەیفم بە هەموو شتێکی تۆ دێ."
ئیتر لەوێوە یەکتریمان ناسی. بەڵام هێندەی نەبرد چووە شەڕی عێراق و بەیەکتر نەگەیشتین.
سەعات بوو بە دەی شەو و هەردووکمان پێکەوە لە کتێبخانە چووینە دەرەوە.

★★★

ئیتر بەم شێوەیە من یارمەتی رازینم دا رزگاری بێ لەو پەراوێزییە. بووینە برادەرێکی دڵسۆزی یەکتر. وردە وردە دەستی کرد بە قسان لەگەڵ ئەوانی تریش و گاڵتە و هەموو شتێك. بوو بە کچێکی ئاسایی. بۆیە ئەوم ناسی تا یارمەتی بدەم. ناسینی من یارمەتییەکی گەورە بوو بۆ ئەو.
"ئێستە رقت لە عێراقە؟" رۆژێك ئەو پرسیارەم لێ کرد.
"لە دوای ناسینی تۆ نا،" هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و وای گوت.
"خۆزگە هەموو عێراقییەك و ئەمەرکاییەك ئاوا ئاشت دەبوونەوە،" من لەبەر خۆم گوتم.

★★★

لەگەڵ پۆلێك هاوڕێی ئەمەریکایی، چووین سوشیمان خوارد. دواتر کردمان بە عادەت، هەموو ئێوارەیەکی دووشەممان دوای موحازەرەی سەعات پێنج دەچووین سوشیمان دەخوارد. ئێوارەیەکیان، زۆر بابەت باس کران و وەختێك هات کەس قسەی پێ نەما.
"جەماعەت پرسیارێکم هەیە،" من بێ دەنگییەکەم شکاند.
هەموو تەماشایان کردم و هەریەك لە بیرە خۆی بەشتێك تێگەیشت پێش ئەوەی پرسیارەکە بکەم.
"فەرموو، بزانین چییە،"کارۆلینی هاوڕێم گوتی.
"هەر یەك لە ئێوە، باسی خەونی خۆی بکات،" بەردەوام بووم، "هەر یەك لە ئێوە خەون بەچییەوە دەبینێ؟"

## ١٥

# خەونی ئەمەریکی و عێراقی

هەر یەکە لە شوێنی خۆی هیکەکی کرد، کەمێك وەستا و بیری کردەوە. وەك ئەوە وابوو ئەمە بۆ یەکەم جارە باسی بابەتێکی جدیان بۆ بکرێ. یاخود دەتگوت قەت بیریان لە خەونێك نەکردووەتەوە. هەر کەس لە ژیانیدا خەون بە شتێکەوە دەبینێ. ئەوانەی سەرناکەون لە ژیان، ئەوانەن یان ئەوەتا هیچ خەونێکیان نییە یانیش ئەوەتا دەیان خەونیان هەیە. ئەوەی خەونی نەبێ کاری بۆ ناکا، ئەوەشی زۆرخەونی هەبێ، بە هیچیان راناگا و هیچیانی بۆ نایەتە جێ. ئەوانەی خەونێکیان هەیە، بەجدی کاری بۆ بکەن دێتە دی. خەون لێرە واتە ئاواتێك مەرامێکت هەبێ لە ژیان.

کارۆلین دەستی پێکرد. هەوڵ دەدەم خەونی هەر یەکێك لێرە وەك خۆی باس بکەم. کارۆلین بەم شێوەیە دەستی پێ کرد:

"خەون بە کوڕێکەوە دەبینم. نازانم کێیە. بەڵام حەز دەکەم کوڕێك بێ، رێزم لێ بگرێ، خۆشمی بوێ، و ئارام بێ. ئێستە کاتی ئەوە هاتووە من مێرد بکەم. چاوەڕێی کوڕێکی لەو جۆرە دەکەم. بیر لە خانوو، ئۆتۆمبیل یان پارە ناکەمەوە. بیر لە خۆشەویستی دەکەمەوە. خۆشەویستی راستەقینە هەموو شتێك دروست دەکا: پارە، ئۆتۆمبیل و هەموو شتێك. بەڵام هیچ یەکێك لەمانە خۆشەویستیی راستەقینە دروست ناکەن، ئەگەر لە بنەڕەتەوە نەبێ. حەز دەکەم یەکێك بێ لەتەکەی ترم تەواو بکات. ئێستە من نیو لەتم. وەك بڵێی روحم سێوێك بووە و لە ناوەڕاستدا کراوە بەدوو پارچە پێش ئەوەی لە دایك بم. لەگەڵ لەدایك بوون یەك پارچەم پێ بەخشرا. ئێستە کاتی ئەوە هاتووە بەدوای نیوەکەی ترمدا بگەڕێم."

خەونی کارۆلین هەموومانی تەزاند. دوای تەواوبوونی هەموو پێکڕا هەناسەیەکمان هەڵمژی و چەپڵەمان بۆ لێدا. ڕێستورانتەکە هەمووی ئاوڕی دایەوە و هەریەك لە شوێنی خۆی خەنییەوە.

"خەونێکی جوانە،" وام پێگوت دوای کڕبوونەوەی هەموویان.

ئەوانی تر هەر یەکە لە شوێنی خۆی هیوای بەدیهاتنی ئەو خەونەی بۆ کارۆلین خواست. دواتر کارتا دەستی پێ کرد.

"جەماعەت، ئێستە نۆرەی منە،" کارتا گوتی. "من باسی خەونی خۆم دەکەم."

"زۆر باشە . . . تکایە . . . بێ دەنگ، با گوێ لە کارتا بگرین،" من تێم هەڵدایە.

هەمووومان بێ دەنگ بووین و کارتا بەم شێوەیە باسی خەونەکەی کرد:

"ئاواتم ئەوەیە ببم بە ڕۆژنامەنووسێکی سەرکەوتوو. هەموو شەو خەون بەوە دەبینم دەرچووم و بوومەتە پەیامنێری یەکێ لە کەناڵە میدیا گەورەکانی ئەمەریکا. حەز دەکەم ببم بە ڕۆژنامەنووس بۆ ئەوەی چیرۆکی کەمینەکان باس بکەم، ئەوانەی دەنگیان بە کەس ناگات، ئەوانەی نابینرێن، ئەوانەی پەراوێز خراون، ئەوانەی شاراوەن. مەبەستم لە کەمینە هەر گرووپی ئیتنی یان نەتەوەیی نییە، بگرە بۆ نموونە کەمینەی کەم ئەندامان. بۆ نموونە، کەمینەی منداڵانی بێ دایکوباوك، کەمینەی بێ ماڵەکان.حەز دەکەم ببمە خانمێکی میدیا، میدیایەك بۆ کەمینەکان نەك بۆ حکوومەت و دەوڵەمەندان و کۆمپانیا زللەکان. ئەگەر سەیری میدیا بکەیت، دەبینی یان باسی کۆمپانیا، یان ئەستێرەکان یان دەوڵەمەند و بازرگانەکان یان سیاسەتمەداران دەکەن. سیاسەتمەدار لە درۆ زیاتر هیچی تری پێ نییە بۆ خەڵەتاندنی خەڵك."

چەپڵەمان بۆ کارتا لێ دا و هیوامان خواست ڕۆژێك دابێ دەربچێ و ببێتە ڕۆژنامەنووسێکی بەرچاو.

"کێی تر؟" پرسیارم کرد.

دوای چەند چرکەیەك وەستان و تەماشاکردنی یەکتر، مات دەستی پێ کرد.

"منیش خەونێکم هەیە،" مات هەڵبەزییەوە.

"باش، با گوێمان لێ بێت،" گوتم.

هەمووومان بێ دەنگ بووین و مات بەم شێوەیە دەستی پێ کرد:

"من خەون بەوە دەبینم کە دوای دەرچوونم، کارێکی شایستە بدۆزمەوە. لە ئاییندە ببم بە خاوەنی خانووی خۆم. خێزان پێك بهێنم و دوو مندالّم هەبێ. هەروەها حەز دەکەم بە خۆم دایکم بەخێو بکەم . . . بۆ خۆم. ئێستە پیر بووە. حەز ناکەم بچێتە خانەی پیران. دەمەوێ خۆم خزمەتی بکەم. راستە کۆمەڵگەی ئەمەریکی لەسەر بنچینەی تاکگەرایی دامەزراوە، بەلاّم من حەز دەکەم دایکی خۆم بەخێو بکەم. لێمەوە نێزیك بێ. هیچ لەوە خۆشتر نییە بۆ من بتوانم ئەوە بکەم. بۆیە بەردەوام بیر لەو شتانە دەکەمەوە."

چەپڵەمان بۆ مات لێدا و هیوای سەرکەوتنمان بۆ خواست. رۆبێرت دەستی بڵند کرد و گوتی منیش خەونێکم هەیە.

"باشە، فەرموو،" هەمووومان پێکرِا وامان گوت و کپ بووین.

رۆبێرت بەم شێوەیە دەستی پێکرد:

"خەونی من رۆژانەیە. حەز دەکەم پێش ئەوەی بنووم و چاوم لەسەر یەك دابنێم، هیچ گرفتم نەبێ. دەمەوێ ژیانێك بژیم ئارام. ژیانێکی سادە. لەوانەیە پاش دەرچوونم، بچم لە گوندێك دوور لە شار ببم بەمامۆستا و وانە بلّێمەوە. مووچەیەکم هەبێ پێی بژیم و دواتر سادە و بێ گرفت بژیم. من کەیفم بەو جەنجالّییەی و راکەراِکی دنیا نایەت. دنیا هێندە کورتە، نایهێنێ ئەوەندە بۆی را بکەی. مامۆستا پیشەیەکی روحیانە و پاکە. خۆم لەوەدا دەبینمەوە، کە بە رۆژ وانە بلّێمەوە، شەوانەش بە رەحەتی بنووم. چەندە سادە بژی، ئەوەندە رق و ئیرەییت بەرامبەر ئەوانی تر کەم دەبێتەوە، ئەوەندە گرفتت کەمتر دەبێ و روح و مێشکت ئارام دەبێ."

هەریەك لە شوێنی خۆمان حەپەساین بە خەونەکەی رۆبێرت. دواتر چەپڵەمان بۆ لێدا و هیوای سەرکەوتنمان بۆ خواست.

"خەونێکی جوانە،" کارۆلین گوتی.

"منیش حەزم لەو جۆرە ژیانە سادەیە،" مات گوتی.

خەریکی ئەو قسانە بووین، سوشیەکانمان بۆ هات. هەر یەکە لە شوێنی خۆمان دەستمان بە خواردنی سوشی کرد.

"ئێستە نۆرەی کێیە، باسی خەونی خۆی بکات؟" پرسیم.

زالا دەستی بڵند کرد و بەم شێوەیە دەستی پێکرد:

"خەونی من هەبوونی منداڵێکە. دوو ساڵ دەبێ زەواجمان کردووە، بەڵام تا ئێستە منداڵمان نییە. هەردوولامان حەزمان لە منداڵێکە. دوایین جار دەرکەوت لە تێستەکان کەوا خەتا لە منە. مێردەکەم لەوەتەی ئەوەی زانیوە هەڵسوکەوتی لەگەڵم گۆڕاوە. یەکتریمان زۆر خۆش دەوێ، بەڵام زۆر لەوە دەترسم نەبوونی منداڵێك ببێتە هۆی پسانی خۆشەویستیی نێوانمان. هەموو مانگ لە خوا دەپاڕێمەوە کە سوڕ نەبینم و منداڵێکمان ببێت. ماوەیەك عیلاج وەردەگرم، ئیتر هیوادارم شتێك بەشتێك ببێ بەم زوانە. . ."

لەو قسانەدا بوو، زالا دەستی بە گریان کرد. هەموومان چەپڵەمان بۆ لێدا و هیوای سەرکەوتنمان بۆ خواست.

"من دەزانم تۆ بەچ ڕێگەیەکدا دەڕۆی و هەستەکەی چۆنە، چونکە خوشکێکم وایە ئەوە ماوەی پێنج ساڵە مێردی کردووە بەڵام تا ئێستە منداڵیان نەبووە،" من وەك دڵنەوایی وام بە زالا گوت.

بۆ گۆڕینی بابەتەکە و خەمڕەواندنەوەی زالا، کارۆلین باسی سوشییەکەی کرد.

"دەزانن جەماعەت سوشییەکەی من زۆر خۆشە،" کارۆلین گوتی.

"هی تۆ چییە؟" من پرسیم.

"ماکیزوشی، دەتوانی هەندێکی لێ بخۆی."

هەندێکم لێی خوارد و گوتم، "هی من ئۆشیزوشییە، تامی کە . . . خۆشە."

کارۆلین هەندێکی لە هی من خوارد و دواتر پرسی، "ئێ . . . گۆران، خەونی تۆ چییە؟"

هەموو پێکەوە ڕوویان لە من کرد و حەزیان کرد بزانن خەونی عێراقییەك و کوردێك چییە.

"ئێمە خەونە ئەمەریکاییەکانمان باس کرد، ئێستە با بزانین خەونی عێراقی و کوردی چییە،" مات وای گوت.

"خەونە ئەمەریکاییەکان جیاواز بوون، وەك ئەوە نەبوو کە خەڵك تێگەیشتوون،" گوتم.

"راستە، خەونی ئەمەریکی گۆڕاوە، ئەو بۆچوونەی جارانی نەماوە،" مات گوتی.

"لێکدانەوەی جیاواز هەیە بۆ خەونی ئەمەریکی،" کارتا گوتی و بەردەوام بوو. "هەندێك دەڵێن خەونی ئەمەریکی ئەوەیە لەسەر بنچینەی خۆماندووکردن و کاری زۆر ژیانێکی خۆش و دەوڵەمەند و ئارام بژی. هەندێك پێیان وایە هەموو کەس لە ئەمەریکا دەوڵەمەند دەبێ لە هەر وەختێکدا بێ، چونکە هەلی یەکسان بۆ هەمووان هەیە. هەندێکی تریش پێیان وایە خەونی ئەمەریکی واتە هەوڵدان بۆ هەبوونی خانوو و کارێکی باش."

هەموومان بۆ ماوەیەك بێ دەنگ بووین و دواتر من بەم شێوەیە باسی خەونی خۆم کرد:

"من دوو خەونم هەیە لە ژیان: یەکێکیان سیاسییە و ئەوی تریان تایبەتە بەژیانی کەسانی خۆمەوە. سیاسییەکە ئەوەیە کە خەون بەدەوڵەتی کوردییەوە دەبینم. بەڕاستی ئەوە خەونی هەموو تاکێکی کوردە. لەوانەیە من زیاتر هەستی پێ بکەم چونکە کاتێ سەفەر دەکەی بۆ وڵاتانی تر ئەوجا دەزانی نەبوونی وڵات چەندە زەحمەت و قورسە. هەردەم لە ناوەوەڕا هەست بەکەموکورتییەك دەکەی و ئەوە جیات دەکاتەوە لەوانی تر. کورد لە ١٩٤٦ دەوڵەتی دامەزراند لە ئێران بەناوی کۆماری مەهاباد، بەڵام ڕێژیمی ئێران ئەو کاتە خێرا لە ناوی برد و سەرۆکەکە، قازی محمد، لەدار درا. هەستی نەبوونی دەوڵەت جارجار خەریکە دەمخنکێنێ. نەبوونی وڵات وەك ئەوە وایە سەرت نەبێ و تەنێ لاشەت بەرێدا بڕوا. ئێوە هیچتان لەو هەستەی تاکی کورد ناگەن، چونکە بێ دەوڵەتیتان نەدیتییە. بۆ نموونە زۆر باش لە تاکێکی فەلەستینی دەگەم کە تێدەکۆشێ بۆ دەوڵەتی فەلەستینی، چونکە نەبوونی دەوڵەت و داگیرکردنی خاك هەستێکە تا سەر ئێسقان گران و دڕدۆنگ. لە هەمووی ناخۆشتر ئەوەیە دەسەڵاتت نەبێ و هیچت پێ نەکرێ."

زالا هەندێ سوشی خوارد و گوتی، "چەند ساڵی تر ئەو خەونەتان دێتە دی؟"
"پرسیارێکە وەڵامدانەوەی زەحمەتە،" گوتم، "بەڵام بە مەزندەی کەسانی خۆم هەست دەکەم لە ماوەی ٥ ساڵی داهاتوودا سەرکردایەتیی کوردی سەربەخۆیی رادەگەیەنێ."
هەموو پێکرا هیوای سەرکەوتنیان بۆ خواستم و داوایان لێکردم بەشی دووەمی خەونەکەم بۆیان باس بکەم. منیش بەم شێوەیە بەردەوام بووم.
"خەونی دووەم بەجێهێنانی ئەرکی سەرشانمە وەك مێردێك، وەك باوکێك و وەك کوڕێك. ئاواتم ئەوەیە کوڕەکەم و کچەکەم بەگەورەیی ببینم و تەواو دامەزرێن. هەموو شتێکی باشیان بۆ بکەم، رێیی راستیان پێ پێشان بدەم."
"بەڵام تۆ گوتت بەس کوڕێکت هەیە،" کارتا پرسی.
"بەڵێ بەڵام مانگی دووی دابێ کچێکیشمان دەبێ،" وەڵامم دایەوە و بەردەوام بووم، "دەمەوێ باوکێکی باش بم بۆیان. وەك مێردێك دەمەوێ هەموو خەونی خێزانەکانم بێنمە دی. هەموو کچێك کە مێرد دەکا کۆمەڵێك خەونی هەیە بە یارمەتی مێردەکەی بیهێنێتە دی. دەمەوێ مێردێکی باش بم و یارمەتی بدەم و خەونەکانی بێنمە دی. وەکو کوڕێکیش هەست بە بەرپرسیارتی هێمنی و خۆشیی ژیانی دایك و باوکم دەکەم. حەز دەکەم پێش ئەوەی بمرن بە خۆشترین ژیان بیانژێنم. دایك و باوکم نەوەی پێش ئێمەن، ئەو نەوەیە لە چەوسانەوە زیاتر هیچیان نەدی. ژیانیان لە ترس و راڕایی و دوودڵی راکەڕاك و نەبوونی بەسەر برد. حەز دەکەم قەرەبوویان بۆ بکەمەوە. ئیتر رۆژ نییە بیر لەو بەرپرسیارێتییانە نەکەمەوە، کەواتە خەونی من خەونێکی درێژخایەنە و لەگەڵ تەمەنم دایە."
هەموو چەپڵەیان بۆ لێدام و هیوای سەرکەوتنیان بۆ خواستم. ئەوانەی چواردەوریشمان لە رێستورانتەکە دەستیان کرد بەچەپڵەلێدان بۆ من، چونکە من بە دەنگێکی بەرز قسەم دەکرد. من مەبەستم نەبوو بۆ ئەوان قسە بکەم، بەڵام ئەوان گوێیان راگرتبوو. ئیتر کاتی رۆیشتنمان هاتبوو و داوای وەسڵەکانمان کرد.

★★★

سەعات سێی پاش نیوەڕۆ، هەستی تەنیایی هێرشی کردە سەرم. پێدا پێدا بێهێزی کردم. لە هەموو شتێك بێزار بووم. دانیشتم ماوەیەك بیرم کردەوە نەمزانی هۆکارەکەی چییە. پێش ئەوەی بێزارییەکەم بگاتە رادەیەك تووشی هەلاکەتم بکات، خۆم گۆڕی و چوومە دەرەوە. نەمزانی بۆ کوێ بچم. دواتر بەدەم ڕێگەوە بڕیارم دا بچمە سەر رووباری کانزەس. ئیتر بە پێ تا ئەوێ چووم. کە گەیشتم، قووڵ تەماشای ئاوەکەم کرد، دواتر چاوم داخست و سێ هەناسەی قووڵم هەڵکێشا. دوای ئەوە، هەستم بە مورتاحی کرد. دەستم کرد بە پیاسە قەراخ رووبارەکە، لە ناکاو گوێم لە گریانێك بوو. بەرەو دەنگی گریانەکە چووم، لە ژێر دارێك و بەرامبەر رووبارەکە کچێك دانیشتبوو دەگریا. منیش بە دوودڵی لێی نێزیك بوومەوە.

"دەتوانم یارمەتیت بدەم؟" پرسیم.

خێرا فرمێسکەکانی سڕییەوە و گوتی، "نا هیچ نییە."

ویستم بڕۆم بەڵام دەستی کردەوە بە گریان، ئەوجارە گریانەکەی بە کوولتر بوو.

"تکایە پێم بڵێ، بۆ دەگری، هیچ بووە؟"

"ناتوانم بۆ کەس قسە بکەم، چونکە کەس تێمناگات،" ئەو گوتی. "لای هەر یەکێك باسی دەکەم گاڵتەم پێ دەکا.

"نا، دەتوانی متمانە بەمن بکەی، لای من باسی بکە."

"کێشەی کۆمەڵە پرسیارێکن!"

"چ جۆرە پرسیارێك؟" بە پەرۆشەوە پرسیم، وەك کابرایەکی تێنوو بۆ قومە ئاوێکی تەزوو.

## ١٦

# خوا یەکە، تەنیایە و بێ هاوتایە

پرسیارکردن لە شتە شاراوەکان زۆرجار مرۆ دەگەیەنن بە دۆزینەوە و زۆرجاریش لە بیابانێکی بێ بن بەجێی دێڵن. مرۆڤی بەوردە و بیرکەرەوە هەردەم بیر لەوە دەکاتەوە دنیا بۆچی دروست بووە، ئەو هەموو ئایینە لەپای چی و سەدان پرسیاری لەو جۆرە کە وەڵامدانەوەیان عاسێیە. کاتێ ڤاریم بینی لەسەر رووبارەکە، هاوڕێیەکی خۆمم بیر کەوتەوە لە کوردستان کە رۆژێك هەمان گریانی دامەزراند بوو. ئەو برادەرەم لە کوردستان پێی نابووە گومانەکان و یەك بەیەك دەیویست گرێیان بکاتەوە. بۆ نموونە دەیویست بزانێ ئەگەر خوا هەموو دنیای دروست کردبێ، ئەی کێ خوای دروست کردووە. بیرکردنەوە لەو پرسانە لەودیو ئیرادەی ئەقڵی مرۆیە و کارێکە مەترسیدار. لەوەتەی دنیا هەیە، سەدان فەیلەسووف لەو رێگەیەدا شێت بوون و خۆیان کوشت و هەر نەشگەیشتنە ئەنجامێك.

مرۆڤ نییە ململانێی لەگەڵ ئایین نەبێ. ئەوەی زۆر پابەندە بە دینەکەی خۆی رۆژێك لە رۆژان دانیشتووە و گومانی لە دینەکەی کردووە. رۆژێك دانیشتووە و گاڵتەی بەهەموو دینێك هاتووە و دواتر تۆبەی کردووە و بەردەوام بووە لەسەر دینەکەی. ململانەی نێوان مرۆڤ و ئایین شتێکە نابڕێتەوە. هەرچی پێغەمبەری دنیا هەیە نەیانتوانی وەڵامی زۆر لەو پرسیارانە بدەنەوە.

★★★

من بۆ خۆم لە بێزاریان هاتبوومە سەر رووبارەکە بۆ ئەوەی هەوایەکی پاك هەڵمژم و دوور بم لە بیرکردنەوەی شتێك کە وەڵامی نییە. کەچی لەوێ تووشی ڤاری بووم کە هەمان بێزاری منی هەبوو. پێکەگەیشتنێکی باش بوو. کاتێ ڤاری باسی دین

و دنیای کرد، من زانیم تووشی هەمان گرفتی برادەرەکەی کوردستانم بووە. بۆیە زیاتر پرسیارم لێ کرد بۆ ئەوەی بزانم چۆن بیر دەکاتەوە و بیر لە چی دەکاتەوە و پرسیارەکانی چین.

"پرسیارەکانت بەدەنگێکی بەرز بەمن بڵێ،" بە زەردەیەکەوە گوتم.

فرمێسکەکانی سڕیەوە و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. تەماشایەکی رووبارەکەی کرد و قاچەکانی درێژ کرد.

"من ڤاریم، لە زانکۆی کانزەس لە ئەدەبی ئینگلیزی دەخوێنم و خەڵکی کانزەس سیتیم،" ئەمەی گوت و بەپێکەنینەوە بەردەوام بوو، "با جارێ یەکتری بناسین."

"من گۆرانم، فولبڕایتەرم، خەڵکی کوردستانی عێراقم و لێرە لە زانکۆی کانزەس ماستەر دەخوێنم لە رۆژنامەوانی."

"پرسیارەکانی من ئەمانەن: ئەگەر خوا هەبێ، ئەی کێ خوای دروست کردووە؟ کام ئایینە راستە؟ ژیان هەیە دوای مردن یان نا؟" ڤاری گوتی.

پرسیارەکانی یەك لە یەکتر قورستر بوون. دیسان برادەرەکەی کوردستان بەبیر هاتەوە کە تووشی نەخۆشی دەروونی بوو بوو بۆ ماوەیەك لەبەر ئەو پرسیارانە.

"پێش ئێمە بەسەتان کەسی تر پرسیاری بوونی خوایان وروژاندووە،" من گوتم.

"هەندێك گەیشتوونەتە قەناعەت و هەندێکیش نا. ئەگەر تەماشای ئایینەکان بکەین، دەبینین هەر ئایینێك خوایەکی هەیە. من پرسیارەکە بەو شێوەیە دەکەم، ئاخۆ خوای هەموو ئایینەکان یەك خوان یان جیاوازن."

ڤاری تەماشایەکی کردم و زەردەیەکی کرد. دواتر هەناسەیەکی تری قووڵی هەڵکێشا. سەروسیمای مورتاح دیار بوو، چونکە کەسێکی شیاوی دیتەوە بۆ ئەوەی باسی ئەو پرسانەی لەگەڵدا بکات.

"باشە ئەگەر خوای هەموو ئایینەکان یەك بێ، ئەی کێ ئەوی دروست کردووە؟" پرسیارەکەی دووبارەی کردەوە.

"بەڕای من ئەو دنیایە لەخۆیەوە دروست نەبووە. هێزێکی شاراوە هەیە ئەو شتەی دروست کردووە. مێشکی مرۆ دەتوانێ خەیاڵ بکات لەو شتانەی ئەو هێزە دروستی کردووە. دوای ئەوە مێشکی مرۆ دەوەستێ. بۆیە دوای ئەوە وەڵام نییە و مرۆ تووشی بێزای دەکا."

"ئەو هێزە کێیە و چییە؟" ڤاری پرسی.

"ئەو هێزە شاراوەیە،" من بەردەوام بووم. "هەر زمانە و ناوێکی هەیە بۆ نموونە بەکوردی پێی دەڵێن خوا، بەعەرەبی، الله و بەئینگلیزی گاد. گرینگ ناوەکەی نییە گرینگ ئەوەیە ئەو هێزە بوونی هەیە. هەر بیرکردنەوەیەك لە دروستکراوەکانی ئەو ئاساییە. بەڵام بیرکردنەوەی لە خودی ئەو هێزە ئەوا ئەقڵ بڕی ناکا."

"باشە دەتوانم پرسیارێك بکەم؟"ڤاری پرسی.

"بۆ نا، هەرچی پرسیارێك دەکەی ئاساییە." من گوتم.

"ئایینی تۆ چییە؟" ئەو پرسی.

"ئایینی ئیسلامە و من موسلمانم."

"ئیسلام، مەسیحییەت، یەهودییەت و ڤادیس و ئەو هەموو ئایینە، بەڕای تۆ کامیان ڕاستە؟" ڤاری پرسی.

"ئەمە پرسیارێکی زۆر قورسە. هەرکەسە و ئایینەکەی خۆی پێ ڕاستە. موسلمانەکان وا دەزانن کە هەموو کەس دەبێ ببێتە موسلمان، چونکە هەر ئەو دوا ئایینە و ئایینەکانی تر ڕەش دەکاتەوە. مەسیحییەت و ئایینەکانی تریش بەهەمان شێوە. بەڵام من پێم وایە هەموو ئەو ئایینانە ڕاستن، جگە لە بت پەرستن. من بتپەرستنم پێ ڕاست نییە، بەڵام هەرچی ئایینی تر هەیە ڕاستە."

"بۆچی پێت وایە هەموو ڕاستن، ئەوە یەکەم جارە گوێم لە موسلمانێك بێ وا بڵێ" ڤاری پرسی.

"چونکە ئەگەر تەماشای ئایینەکان بکەین، دەبینین هەموویان باسی شتی باشە دەکەن. هەموویان دەڵێن مرۆڤ دەبێ باش بێ و دوورکەوێتەوە لە خراپە."

"ئەی بۆچی زۆرجار گرفت لە بەینی موسلمانان و مەسحییەکان یان مەسیحی و جوولەکە روودەدا؟" ڤاری پرسی.

"لەبەرئەوەی پرسی ئایین بەسیاسەت دەکرێ، کاتێ ئایین دەچێتە ناو سیاسەت ئا لەوێ هەموو ئایینەکان زەربی سفر دەکەم، چونکە بۆ مەرامی سیاسی دێنە بەکارهێنان. بۆ نموونە، لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکان، بەسەتان رێکخراو و حیزبی ئیسلامی هەیە، هەموو ئەمان بە فلسێك، چونکە بۆ پارە و دەسەڵات و خزمەت و بەرژەوەندی گرووپێك دروست دەبن و دێن بەناوی دین هەرچی بیانەوێ دەیکەن و خەڵکی چەواشە دەکەن."

"موسلمانەکان چۆن لە دینی مەسیحی گەیشتوون؟" ڤاری پرسیاری کرد.

"ئیسلام دینی مەسیحییەتی قبووڵە. لە قورئان زیاتر لە ٥٠٠ جار باسی حەزرەتی مەسیح کراوە بەباشە. یەکێك لە مەرجەکانی موسلمانبوون ئەوەیە کە دەبێ باوەڕت بەهەموو پێغەمبەرەکانی خوا هەبێ بە حەزرەتی مەسیحیشەوە."

هەردووکمان بۆ ماوەیەك بێ دەنگ بووین و تەماشای رووبارەکەمان دەکرد. ڤاری وازی لە گریانەکەی هێنا و دڵی هێور بووەوە.

"ئەی باشە ژیانی پاش مردن، رات چییە؟" ڤاری پرسی.

"هەموو ئایینەکان باسی ژیانی پاش مردن دەکەن. هەموو ئایینەکان باسی ئەوە دەکەن ئەگەر لەم دنیایە باش و پاك بیت ئەوا ژیانی ئەو دنیات خۆش دەبێ. بۆ نموونە موسلمانان باوەڕی تەواویان بەزیندوو بوونەوە و بەهەشت و دۆزەخ هەیە."

"کێ دەڵێ ئەمە وایە، مرۆڤی ئاقڵ نابێ هەروا بەهەموو شتێك باوەڕ بکە،" ڤاری مشتومڕی کرد.

"راستە مرۆڤ دەبێ گومانی هەبێ و بیر بکاتەوە ئەوجا باوەڕ بێنێت. بەڵام ئەگەر هیچ شتێك لەمان راست نەبێ، خۆ وا باشترە مرۆ کاری باشە بکات، من تەواو باوەڕم بەویژدان هەیە، کاری باشە خۆراکی ویژدانە. چەندە کاری باشە بکەی ئەوەندە ویژدانت ئاسوودە دەبێ. هەموو جار دەڵێم، کاری باشە و مرۆیی بکە لە دنیا، جا

ئەگەر لەو دنیا پاداشت و سزا هەبێ ئەوا پاداشت دەکرێیی، ئەگەر نەشبێ خۆ هیچ نادۆڕێنی، بەسەربەرزی و پاکی ژیای."

"زۆر راستە،" ڤاری بەدڵێکی خۆش گوتی."گۆران زۆر سوپاس بۆ گفتوگۆکردن."

"تۆ باوەڕت بەچ ئایینێك هەیە؟" من پرسیم.

"من باوەڕم زیاتر بە بودایە."

"زۆر باشە، رۆژێك پرسیاری ژیانی دوای مردن لە سیدارتە دەکەن . . . ."

"سیدارتە کێیە؟" ڤاری قسەکەمی پچڕی و پرسیاری کرد.

"سیدارتە ناوی بودایە،" بەردەوام بووم، "ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ بۆچی هێندە بیر لە ژیانی دوای مردن دەکەنەوە. بڕۆن بەژیانەی ئێستاتان خەریك بن. مەبەستی بودا ئەوەیە کە هێندەی بیر لە ژیانی ئەولا مەکەوە، بڕۆ کاری باش بکە و ئیتر شتەکان خۆی باش دەڕوا."

بۆ ماوەیەك هەردووکمان بێ دەنگ بووین. دواتر ووردە ووردە بە پێ هاتینەوە ناو بازاڕ و لەوێ یەکتریمان بەجێهێشت.

★★★

گفتوگۆ لەگەڵ سێ ماڵباتەکە زۆر سەیر دەستی پێکرد. لە گراند کانیەن یەکتریمان ناسی لە کاتی نانخواردنی نیوەڕۆ لە رانج. من بەتەنیا بووم ئەوانیش سێ کەپڵ. یەکیان خەڵکی نیۆرك، یەکیان خەڵکی کالیفۆرنیا و ئەوی تریان خەڵکی ئیلینۆیس بوون. بۆ پشوو هاتبوونە لاس ڤێگاس.

لە کاتی نانخواردن، یەکێك لە ئافرەتەکان، دای لە زرمەی گریان و نانەکەی لێ تاڵ کردین. ئەوانی تریش و منیش بەدەستییەوە گیرۆدە بووین.

"دەتوانم بزانم، گرفتی چییە؟" من پرسیم دوای ئەوەی کەمێك هێور بووەوە.

## ١٧

# ئەخلاق لە ئەمەریکا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست

لە ئەمەریکا سێ ماڵباتم ناسی زۆر سەرنجیان راکێشام. چەندە گرفتی خۆیانیان بۆ باس دەکردم، ئەوەندە دواتر بیرم دەکردەوە و بەراوردم دەکرد لەگەڵ ئەو کێشانەی کە لە عێراق ماڵباتی ئاسایی وەك ئەوان رۆژانە پێوەی دەناڵێنن. لە رێگەی ئەو سێ ماڵباتەوە من زیاتر لە کولتوور و ژیان و شێوازی بیرکردنەوەی کۆمەڵگەی ئەمەریکایی گەیشتم. باسکردنی کێشەکان بەنۆرە بوو، چەندە شتیان پێ گوتبام، ئەوەندە منیش شتم پێ دەگوتن لەبارەی ژیان و کولتووری عێراق.

★★★

هەر تاکێکی ئەو دنیایە بگری بەلایەنی کەم گرفتێکی هەیە. هەندێ دەڵێن پارە چارەسەری هەموو شتێك دەکا، بەڵام جاری وا هەیە پارە خۆی دەبێ بەئاریشەیەکی گەورە بۆ خاوەنەکەی. دەوڵەمەندەکان کێشەیان زیاترە لەچاو هەژار و کەم دەرامەتەکان لە دنیا. گەلی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست وا دەزانن ئەمەریکاییەکان گرفتیان نییە و لە خۆشییەکی بەهەشت ئاسادا دەژین. هەر بۆیەشە، خەڵکی وڵاتانی دواکەوتوو بە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشەوە خەون بەژیانی رۆژئاواوە دەبینن. ئەمەریکاییەکانیش شتێك لە بارەی ژیانی رۆهەڵاتی ناوەڕاست و ئەو گرفتانە نازانن کە رۆژانە پێوەی دەناڵێنن. یەکێ لەو رێگەیانەی دوو گەل زیاتر لە یەکتر نزیك دەکاتەوە، ئەوەیە سەریان دەربچێ لە کێشە و ئاریشە و گرفتی رۆژانەی یەکتر. هەر بۆیە رۆهەڵاتناسان بەمانگ، بگرە بەساڵ لە وڵاتانی رۆهەڵات ماونەتەوە بۆ ئەوەی لە رێگەی تێگەیشتنی کێشە و گرفتی رۆژانە باسی ئەو وڵاتانە بکەن.

هەندێ گرفت هەن گشتین، هەر کەس لە هەر کونجێکی دنیادا بێ پێوەی دەناڵێنێ. گەلانی دنیا هەندێ کێشەی هاوبەشیان هەیە وەك: بێکاری، سیستمی دیکتاتۆری، پێشێلکردنی مافەیلی مرۆ لەلایەن تاقم و گرووپ و حکوومەتانەوە. یەکێ لە ئەمەریکا بێکار بێ زۆر باش لە ئازارەکانی بێکارێك تێدەگات لە رۆهەڵاتی ناوەڕاست. یەکێ لە ئافریکا سەرۆکەکەی دیکتاتۆر بێ زۆر باش لە ئازارەکانی گەلێکی تر لە ژێر سیستمی دیکتاتۆری تێدەگا. پێشێلکردنی مافەیلی مرۆ لە هەر شوێنێك بێ تێدەگەیشترێ و خەڵك هەست بەمەینەتی ئەوی تر دەکا.

★★★

هەر شەشیان تەماشای یەکتریان کرد و نەیانزانی چۆن و لە کوێ دەست پێبکەن. منیش کەمێك چاوەڕێم کرد بۆ ئەوەی یەکێکیان بەقسە بێ و حاڵەتەکەم بۆ شی بکاتەوە. بەڵام ماوەیەك چاوەڕێم کرد و کەس نەهاتە گۆ. منیش لێم بووە مەراق.

"هەبوونی کێشە ناخۆشە، لەوە ناخۆشتر ئەوەیە یەکێك تازە بناسی و دەست بەگریان بکا و نەزانێ چ باسە،" من بەتەوسێکەوە وام گوت.

هەر شەشیان تۆزێك هەستیان بەشەرمەزاری کرد. منیش تۆزێك بێ تاقەت بووم لەو گرتەیە.

"نا هیچ نییە، ماگی، دایکی بەتەنێیە و وەزعی باش نییە،" چارلس وای گوت و ویستی بەوەندە کۆتاییی پێ بێنێت.

"مەبەستت . . . دایکی ماگی نەخۆشە؟" من لەبەر خوی رۆژنامەنووسیم دەمویست زیاتر تێبگەم.

"نا، دایکی پیرە و دەشیهەوێ هەر بەتەنێ بژی،" جولیان گوتی.

"بەڵێ، خۆت دەزانی کۆمەڵگەی ئەمەریکی تاکەگەراییە و خەڵك وا راهاتووە تەنێ بژی،" بیکۆ گوتی.

"ماگی لەو گەشتەدا هەر ئەوی لە بیرە، چونکە پێش ئەوەی بێین دایکی تۆزێك نەساخ بوو،" سوزی وای گوت.

"بەڵێ، ماوەیەکە دەمانەوێ قەناعەتی پێ بکەین بچێ لەگەڵ ماگی بژی، بۆ ئەوەی لە دوا ساتەکانی ژیانیدا یەکێ هەبێ ئاگای لێ بێ،" کان وای گوت.

"ئەی باشە بۆ نایبەنە خانەی پیران؟" من پرسیم.

"ئەویشی پێ خۆش نییە و ناچێ،" کارل وای گوت.

ماگی قسەیەکی نەکرد و جارجار فنەفنێکی دەکرد. ئەوانی تر بەهەر پێنجیان بابەتەکەیان تێگەیاندم. ئەوانیش وەك ماگی خەمیان لەو بابەتە دەخوارد. ورد و درشتی پرسەکەیان دەزانی. دەیانزانی ماگی چەند جار داوای لە دایکی کردووە و بێ لەگەڵی بژی و دایکی چۆنی وەڵام داوەتەوە. هەر پێنجیان، بەوردی بۆ منیان باس کرد کە چەندە ناخۆشە دەردی پیری. ئەوە یەکێکە لەو کێشانەی کە کۆمەڵگەی ئەمەریکایی بەدەستییەوە دەناڵێنێ. کۆمەڵگەی تاکگەرایی وا دەخوازێ کە هەر یەکە تەنێ بژی، تەنانەت ئەگەر زۆریش پیر بێ و بکەویە ناو جێ. پیر هەیە دەچێتە خانەی پیران و هەشە ناچێ. ئەوەی ناچێ ژیانی زۆر زەحمەتە، چونکە تەواوی ساتەکانی ژیانی بەتەنێ بەسەر دەبات.

دواتر لە نانخواردن بەردەوام بووین و جار جارە هەر یەك لە ئێمە هەڵدەستایەوە و کەمێك شەربەتی دەهێنا، چونکە لە رانچەکە شەربەتی سروشتی زۆر خۆشی لێ بوو. هەر هەموومان خواردنەکەمان بەدڵ بوو.

"هاورێییان، دەزانن ئەو کێشەیە لای ئێمە نییە،" من لەسەرخۆ گوتم.

"کام کێشە؟" جولیان پرسی و ئەوانی تر هەموویان تەماشای دەمی منیان کرد بۆ ئەوەی بزانن باسی چی دەکەم.

"منداڵ لەسەری واجبە دایك و باوکی بەخێو بکا،" من گوتم، "دەزانن کۆمەڵگەی ئێمە تەواو پێچەوانەی کۆمەڵگەی، ئەمەریکاییە چونکە کۆمەڵگەیەکی بەکۆمەڵە نەك تاکگەرایی."

هەر هەموویان بەدەم نانخواردنەوە سەری ئەرێیان بادا و تۆزێك سەیریان پێهات.

"لای ئێمە ئەگەر پیرەکە پیرێکی باش و بێ رکفت بێ، ئەوا خوشك و برا لەسەری بەشەڕ دێن و ئەو دەڵێ بای لای من بێ و ئەوی تر بۆ لای خۆی ڕایدەکێشێت،" من بەردەواوم بووم.

"ئەی ئەگەر باش نەبوو؟" کارل بە پێکەنینەوە پرسی.

"ئەوا لە هەموویان دەبێتە بەلا،" من گوتم. "خانەی پیران لای ئێمە مۆدیل نییە، ئەوەی دایکی یان باوکی بباتە خانەی پیران بە چاوێکی سووك تەماشای دەکەن و ئابڕووی دەچێ."

ماگی لە نانخواردن تەواو بوو و ئێمەش لەگەڵ ئەو دەستمان لە نانخواردن هەڵگرت و بۆ گۆڕینی کەشوهەواکە و لەبیربردنەوەی ئەو گرفتە چووینە دەرەوە. گەشتەکەی من بوو بوو بەدوو، چونکە من سێ کەپڵی ڕێکوپێکم تێدا ناسی و زۆریان لێوە فێربووم و ئەوانیش زۆر لە منەوە فێر بوون. باسی ئەو کێشانەمان دەکرد کە لای گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست باوە و لای گەلی ئەمەریکا باو نییە. بەپێچەوانەشەوە.

بۆ نموونە هەر سێ کەپڵ باسی گەورەترین کێشەیان کرد لە ئەمەریکا، ئەویش کێشەی ئەخلاق بوو. بەپێی قسەکانی ئەوان، قەیرانی ئەخلاق لە پێشەوەی کێشەی تیرۆر و قەیرانی ئابوورییەوەیە، بەڵام کەس باسی ناکا و کەس پلانی بۆ چارەسەری پێ نییە. ئەخلاق لە کۆمەڵگەی ئەمەریکی واتە دوورکەوتنەوە لە زانست و خوێندنەوە و نزیکبوونەوە لە خواردنەوە و بێ هۆشی و سێسکبازی و تێکچوونی شیرازەی کۆمەڵگە. پێیان وابوو کۆمەڵگەی ئەمەریکی زیاتر بەرەو ئەو رووتەمەنییە دەڕوا و شیرازەی خێزان خەریکە بەرەو نەمان دەچێ.

منیش لە بەرامبەر ئەوەدا باسی ئەوەم کرد کە ئەخلاق لای گەلانی ڕۆژهەڵاتی بەشێوەیەکی ترە. بێ ئەخلاقبوونی خێزانێك بەندە بەئافرەتانەوە. هەموو ئەخلاق لە ئافرەتان بەستراوەتەوە. ئەگەر پیاوێك کاری خراپ بکا، ئەوا تا رادەیەك ئاساییە و زۆرجاریش سەربەرزییە، بەڵام ئەگەر خوشکی هەمان کەس کارێکی خراپ بکا، ئەوا دەیکوژن یان بەندی دەکەن، یانیش سزای دەدەن بەلێدان. لای گەلی ئەمەریکایی کێشەی کوشتن لەسەر شەرەف نییە، بەڵام ئەوە کێشەیەکی گەورەیە لەلای گەلانی ڕۆژهەڵاتی.

کچێك لە ئەمەریکا هەرگیز لە کێشەی کچێکی ڕۆهەڵاتی ناگا ئەگەر بێو لەسەر شەرەف بێتە کوشتن، چونکە قەت شتی وای نەبیستووە. خەڵکی ڕۆهەڵات چاوی زەق دەبێتەوە کاتێ دەبینێ کچانی ڕۆژئاوا بەو شێوەیە ئازادن و هەڕەشەی کوشتنی ئەوەیان لەسەر نییە، ئەگەر لەگەڵ کوڕێك قسان بکەن. سەپاندنی بنەما ئایینییەکان لە نێو گەلانی ڕۆهەڵاتی بەهەڵە و تێکەڵکردنی دین و دابونەریتی کۆن و مردوو گەورەترین کۆسپن و ئاریشەن. لە بەرامبەر ئەوەدا، دۆزینەوەی ئیش و پارەپەیداکردن و خۆسەپاندن لە نێو کۆمەڵگە و بوونی خەونێك خەمی هەر بابایەکی ئەمەریکاییە.

لەگەڵ ئەو سێ کەپلە ئەمەریکاییە زۆربەی جار ئیمەیلمان ئاڵوگۆڕ دەکرد و گفتوگۆکانمان بەردەوام بوو. زۆرجار وتارمان بۆ یەکتری دەنارد کاتێ لە شوێنێك بمانخویندباوە. یەکتریمان ئاگەدار دەکردەوە. هەر سێ خێزان زۆر ڕژد بوون و بەدوای ئەو شتانەوە بوون.

★★★

سەعات چواری ئێوارەی پایزێکی سارد بوو. زەنگی مۆبایلەکەم لێی دا. دێریکی هاوڕێم بوو.

"هەواڵێکی زۆر خۆشم پێیە،" لەسەر تەلەفۆن وای گوت.

"چییە؟" من گوتم.

"ناکرێ لەسەر تەلەفۆن،" دێریك گوتی، "دەکرێ ئێستە بێمە لات؟"

"من دوای پێنج خولەکی تر دەگەڕێمەوە ماڵ، لەوێ چاوەڕێت دەبم."

"باشە."

مۆبایلەکەم داخست و پێم هەڵگرت بۆ ئەوەی لە کاتی خۆیدا بگەمەوە ماڵ. کزە بایەکی سارد دەهات. بایەکە گەڵا سیسباوە وەریوەکانی بەناو کۆڵانەکاندا دەهێنا و دەبرد. من زۆر تامم لەو کەشوهەوایە دەکرد. دوای چوار خولەك گەیشتمەوە ماڵ و بینیم دێریك لەبەردەم دەرگا وەستاوە. پێکەوە چووینە ماڵەکەی من. قەمسەڵەکانمان داکەند و لە هۆڵەکە دانیشتین.

"ئادەی پێم بڵێ، بزانم هەواڵە خۆشەکە چییە؟" من پرسیم.

"بەڕای تۆ دەبێ چی بێ؟" ئەو پرسی.

"بڵێ بزانم ڕازی بوو؟" من وام گوت.

"بەخوا باش بۆی چوویت."

# ١٨

# ئێران و ئەمەریکا

من وانەیەکی هەڵبژێردراوم لە قوتابخانەی گەیاندن وەرگرت. وانەکە ٣٠ قوتابی لەخۆ گرتبوو. هەر هەموویان ئەمەریکایی بوون، جگە لە منی کورد و پەریسای ئێرانی. پەریسا خەڵکی تاران بوو و یەکەم وەرزی بوو لە زانکۆی کانزەس. کچێکی باریك، سپیکەڵەی پرچ زەرد بوو. بەشێوازی جلی ئێرانییەکە نەبووایە فەرقت پێ نەدکرد لەگەڵ کچێکی ئەمەریکایی. چون لە خێزانێکی کراوەی ئێرانی بوو، هەر خێرا فێری دابونەریت و هەڵسوکەوت و کولتووری ئەمەریکایی بوو. من بەجلوبەرگی را زانیم ئێرانییە کە کابۆ و بەدییەکی تەسك لە ژێرەوە لەگەڵ مانتۆیەك بەسەریدا. حەزم دەکرد بزانم پەریسا بۆچی لەچکی لەسەر نییە. چونکە ئێرانییەکان بەردەوام لەچك لەسەر دەکەن. دەمویست بزانم ئاخۆ خۆی فڕێی داوە لە ئەمەریکا، یانیش کاریگەریی ئەوەیە لە ئێران دوورە و چاوی دەسەڵاتی ئێرانی بەسەرەوە نییە.

هەر لە یەکەم ڕۆژی کلاسەکە، دێریك و پەریسام نەناسی. دوای تێپەڕبوونی دوو مانگ بەسەر کلاسەکە، ڕۆژێك لە دەمەقاڵێیەکی توندی نێوان دێریك و پەریسا، ئەوانم ناسی. کە چوومە ژوورەوە تەنێ ئەوانی لێ بوو. دەمەقاڵێیەکی توندیان بوو. داوای لێبوردنم کرد و چوومە دەرەوە. دوای کلاسەکە دێریك هاتە لام.

"من دێریکم،" وای گوت، "وا بزانە هیچت گوێ لێ نەبووە لە گفتوگۆکەمان."

"کام گفتوگۆ؟" من پرسیم.

"شەڕە قسەکەم لەگەڵ پەریسا،" وای گوت، "ئەو کچەی لەگەڵمانە لە کلاس."

"ئەها ئێرانییەکە،" من گوتم.

"دەیناسی، چۆنت زانی ئێرانییە؟" ئەو پرسی.

"بەجلوبەرگی و دواتر تازە ناویت هێنا، بەناوەکەشڕا دەزانم."

ئیتر لەگەڵ دێریك بووین بە هاورێ. دێریك گەنجێکی باریك و سوور و سپی، چاو شینی قژ زەرد بوو. خەڵکی ویلایەتی نیویۆرك بوو لە زانکۆی کانزاس قوتابیی دکتۆرا بوو لە گەیاندن. لەبەر هەرزانیی و باشیی زانکۆکە، ئەوێی هەڵبژارد بوو. کوڕێکی زیرەك بوو. کەیفی بە ئەدەب نەدەهات. رقی دنیای لە شیعر و پەخشان و چیرۆك دەبووەوە.

زۆر مەبەستم بوو بزانم، بۆچی دێریك و پەریسا ئەو دەمەقاڵێ تووندەیان بوو. ئێران و ئەمەریکا لەسەر ئاستی سیاسەت بەینیان باش نییە، ئاخۆ دەبێ پرسەکە سیاسەت بێ. بیرم لەوە دەکردەوە چۆن سیاسەت هاتووەتە نێوان دوو قوتابی لە ئەمەریکا، ئاخۆ دەبێ شەڕی چییان بێ. سیاسەتی بەینی وڵاتان کاریگەریی نەرێنی دەبێ لەسەر هاوڵاتییانی هەردوو وڵات. تەنانەت ئەگەر لە زانکۆش پێکەوە بخوێنن.

"لەوانەیە دێریك سی ئای ئەی بێ و پەریسا بەکار بێنێ بۆ زانیاری وەرگرتن و پەریساش پێی زانیوە و تووڕە بووە،" بۆ خۆم بیرم دەکردەوە.

رۆژێکی تر بەهەمان شێوە، بەسەر شەڕە قسەی هەردووکیاندا چووم. هەردووکیان هەستیان بەشەرمەزاری کرد و داوای لێبوردنیان کرد. من ئەمجارە نەچوومە دەرەوە، چونکە هێندەی نەما بوو وانەکە دەست پێ بکات. گوێم لێ بوو دێریك دەیگوت ئەو هیچ پێوەندییەکی بەسیاسەتی دەرەوەی ئەو دوو وڵاتە نییە. ئەوە زیاتر وای لە من کرد کە گومانەکانی خۆمم پێ راست بن.

دوای تەواوبوونی کلاس، دێریك هاتە لام. دیسان داوای لێبوردنی کرد. زۆر پەرێشان و خەمبار دیار بوو.

"دەتوانم، بزانم چی لە نێوان و تۆ و پەریسادا هەیە؟" پرسیم.

"بەڵێ، بۆ نا، تۆ هاورێیەکی نێزیکی منی،" دێریك وای گوت، لەوانەشە بتوانی یارمەتیم بدەی.

"ئەوەی بە من بکرێ دەیکەم،" گوتم.

"بەڕاستی؟" ئەمەی گوت و توووند لە باوەشی گرتم و دەستی کرد بەگریان و گوتی: "تکایە یارمەتیم بدە، من لە کێشەیەکی زۆر گەورەدام."

من زۆر نیگەران بووم کاتێ ئەو گوتی لە کێشەیەکی گەورە دایە.

"کەواتە من راست بۆی چووم، ئەوانە کێشەی سیاسییان هەیە، باشە خۆم تووشی چی کرد،" بۆ خۆم بیرم کردەوە.

دێریك فرمێسکەکانی چاوی سڕییەوە و منی داوەتی قاوەیەك کرد لە کانزەس و یونیەن و دەستی بەقسان کرد.

"من دەمێکە پەریسام خۆش دەوێ،" دەنگی پڕ بوو لە هیوا.

کاتێ باسی خۆشەویستی کرد، نیگەرانییەکەم تۆزێك سووك بوو.

"هەست دەکەم ئەویش منی خۆش دەوێ، بەڵام رێگری هەیە،" دێریك بەردەوام بوو.

"رێگری وەك چی؟" من پرسیم.

"ئەو زۆر حەزی لە چیرۆك و شیعر و ئەدەبە، منیش هیچی لێ نازانم و کەیفم پێ نایەت،" قوڕگی پڕ لە گریان بوو.

" ئێ کوڕی باش، ئەگەر مەسەلە هەر ئەوە بێ، ئەوە زۆر ئاسانە،" هەناسەیەکم هەڵکێشا و بە ئاسانی دامەوە.

"چۆن؟" پرسی.

"سادەیە، دەبێ کەیفت بە ئەدەب بێ و شیعری بۆ بنووسی،" من گوتم، "دڵنیای هەر ئەوەیە و هیچی تر نا."

"بەڵێ، پێشتر زۆر برادەر بووین، بەڵام رۆژێکیان چەند کورتە چیرۆکێکی نووسی بوو، منیش گاڵتەم پێیان هات کاتێ بۆمی خوێندنەوە."

"ئێ ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە،" من گوتم، "لەبەرئەوەی تۆ گاڵتەت بەهەستی ئەو کردووە."

"تکایە یارمەتیم بدە، من ئێستە چی بکەم باشە،"  فرمێسك لە چاوەکانی هاتنە خوارەوە.

کاتێ بینیم دەگری زانیم کە دێریك زۆر بە جدی عەشقی پەریسا بووە.
"نیگەران مەبە، من بیرۆکەیەکم هەیە،" دڵنەواییم دایەوە.
"چییە؟" بە پەرۆشەوە گوتی، "تکایە پێم بڵێ."
"من پێنج کورتە چیرۆکت بۆ دەنووسم و دەتدەمێ و برۆ بۆی بخوێنەوە،"
کاتێ ئەوەم گوت لە باوەشی گرتم و لە خۆشیاندا پێدەکەنی و دەگریا.
بۆ هەفتەی رۆژی پاشتر، من چەند کورتیلە چیرۆکێکم بۆ هێنا.

## ١

پێی گوت :کە دڵۆپە ئاوێك دەکەوێتە ناو دەریایەك، هیچ سەروشوێنی نامێنێ . منیش دڵۆپێك ئاوم لە ناو دەریای عەشقی تۆدا .کیژۆڵەش بزەیەکی کرد .دەمی وەك خونچەیەکی تازە پشکوتو دەرچوو .

پێی گوتەوە :ڕەنگم لەچاو ڕەنگی ڕوومەتی ئاڵ و جوانی تۆوە شەرمەزارە . کچەکە نیگایەکی کرد و *هومائاسا تیرێکی تێسرەواندە شانی ڕاستی .

"بەتیری چاوەکانت هەم دنیا و هەم دینم لە دەست دەدەم "بێباکانە ئەمەی لەدەم هاتە دەر و ئینجا هەڵیدایەوە "چی بڵێی من بەشەکر حسێبی دەکەم ".

کچەکە لووتبەرزانە هەڵسایە سەرپێ و گوتی :تۆ و من وەك تاڵێکی ئاوریشم و پەتێکی ئەستوور واین .تۆ لە دۆڵێك دەخوێنیت و منیش لە دۆڵێکی تر .

"دلڕەقی ئەم ئیراکە *دەیان شاخ خورد دەکاتەوە "ئەمەی بەخۆی گوت، سەرێکی بادا و پیشێکی بێئومێدی خواردەوە.

*هوما :لە ئەفسانە کۆنەکاندا دەڵێن بەو باڵندەیە گوتراوە کە لەسەر شانی هەر یەکێك نیشتبایەوە دەکرا بە پاشا .

*ئیراك :ئەو دارەیە دار سیواکی لێ دروست دەکرێ .

## ٢

بەقسەی خۆش ,لەو سەرماوسۆڵەدا، لە خەوی شیرین بێداری کردەوە .بە ملپێچ سەر و دەم و چاوی جوان پێچایەوە و ناردی نانی گەرم بۆ بەیانی بکرێت .کچۆڵەی 9 ساڵانیش، باریك، سوورئاڵی تەبەش پانی گەش، پێدا پێدا ڕێی کردە نانەواخانەیەك . تا گەیشتە جێ سەرلووتی سوور دەچووەوە ,برژانگە گەورەکانی بەستای .ریزێکی یازدە کەسی لەسەرمان پاڵیان بەپشت یەکدا بوو و چاوەڕێی نانی گەرم بوون .کچۆڵەی نەرمونیان و خەواڵوو، لە دواوە ریزی بەست .کاتێ خەڵکەکە چاویان پێی کەوت یەك بەیەك رەپێش خۆیاندا تا گەیشتە پێشەوە .ئەمەش زۆر دڵی کچەکەی خۆش کرد .

"ئەم هەزار دینارە هی کێیە"؟ نانەوا پرسی .

"هی منە بایی پێنجسەتم دەوێ "بەدەنگێکی کزی نووساو وەڵامی دایەوە .

پێش ئەوەی دوایەمین نانی هەڵگرێت و بەرەو ماڵ بێتەوە، نانەواخانەکە تەقییەوە و دنیا تاریك بوو، چرە دووکەڵ ئەو ناوەی تەنییەوە، شوێنەکە خوساوی خوێن بوو .دایکی کە بەمەی زانی، لێوی لە حەژمەتانا کرۆشت و بیری کردەوە "خۆزگە لەخەو بێدارم نەکردبایەوە ".ڕووەو خوا دەستی بەرز کردەوە "خوایە بۆ؟"

"چونکە کچۆڵەکەتان خەوی دەهات، ئەویش بۆ خۆی بردییەوە "دەنگێکی نادیار لە پشتەوە وای پێ گوت .

## ٣

لە سێیەمین نهۆم دەیڕوانییە سەر شەقامە بێگەردەکەی بەردەم باڵەخانەکە . چاوی لەگەڵ ئۆتۆمبێلێك دەگەڕا، بروسکە ئاسا وێنەیەکی کەوتە بەرچاو .کەمێك بەسەر دیواری باڵکۆنەکەدا داچەمییەوە و وورد سەیری وێنەکەی کرد .مرۆییەکی قژ قەترانی رەنگ ئەسمەر .لووتێکی قنج و باریك .چاوە رەشەکانی لەبەر تیشکی خۆر دەبریسکانەوە .هەوڵی دا تەواو ڕووی وێنەکە ببینێ، چاوی بڕی نەکرد .

"ئەی خوایە لەو  هەموو جوانییە "!هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و ئەمەی لەبەرخۆیەوە گوت .

خێرا سواری ئاسانسەرەکە بوو تا بچێت وێنەکە هەڵگرێتەوە" .دەبێ چ کوڕێك ئەم وێنەیەی لێ کەوتبێ .ئەگەر ژمارەی تەلەفۆنەکەی لەسەر بێ ,زەنگێکی بۆ لێ دەدەم و دەیدەمەوە "پازدە چرکەی ناو ئاسانسەرەکە ئەمەی بەبیردا هێنا .خێرا رای کردە لای شوێنی مەبەست دوای ئەوەی دەرگەی ئاسانسەرەکە کرایەوە .تامەزرۆ وەك سکپڕێك بۆ هەنارێکی ترش وێنەکەی بەلەش و لاریدا هەڵگەڕاند و هێنایە ئاست چاوەکانی .چاوەکانی کردەوە، بینی وێنەکە خۆیەتی !

## ٤

گەنجێکی روومەت ئاڵ، بەژن زراڤی رەنگ گەنمی، چاوی بڕیبووە تەنیا یەك کچ لە ناو ئەو پۆلە کچەی دەیانڕوانییە ئاوە لیخنەکەی بەردەمییان" .چییە ئەگەر بچم پێی بڵێم حەز دەکەم ماچت بکەم "خەیاڵی بلّقی دا" .ئەگەر گوتی قسەی قۆڕ و تفێکی بەڕوومدا هەڵدا؟ "!ئەمەشی خستە سەر خەیاڵەکانی .دواجار تەلبەندی شەرمی شکاند و پێی نایە گۆڕەپانی بوێری، بەبیرەبیر پێدا پێدا خشییە لای پۆلە کچەکە .

"ئەم داوایەی من پێچەوانەی رێژەنی ئاو نییە .رەنگە رازی بێ "گەنجەکە بەدەم رێوە بیری دەکردەوە .پێیەکانی گران بوون وەك چۆن دیلێکی نەقۆرا بەکەوشی ئاسن دەیگوازنەوە، پێنگاوەکانی سڕ سڕ بوون .

کچەکەی ناو پۆلە مەلەکەی هاوتای خۆی قژێکی سوورئاڵ، گوپنی سوور سوور، لە دوورەوە بەگوڵە هەنار خۆی پێشان دەدا، لە نێزیکەوە تەڕایی لێ دەچۆڕایەوە .لێو باریك، سمت خڕخڕ، بەپتێك دەپەڕی .زەردەخەنەی لەناو ئاوە لیخنەکەدا رەنگی دەدایەوە .

کوڕەکە گەیشتە ئەوێ و بەنەرمی رووی لە کچەکە کرد، بەلێولەرزەوە گوتی "حەزم لێیە ماچت بکەم ."

کچەکە دایە قاقای پێکەنین و گوتی :بۆ ئاوا؟

## ٥

لە ڕووخساریدا زۆری پێ خۆش بوو کە پێم گوت "بڕیارم داوە چی تر قسەت لەگەڵ نەکەم، سڵاوت لێ نەکەم و تەماشات نەکەم"، بەڵام لە دڵەوە پێی خۆش نەبوو. بۆیە لە ڕقان گوتی "هیوادارم جێبەجێی بکەیت!". هەردوو لا لە دڵمانەوە ئیمزامان کرد کە من دەبێ پابەند بم بەو بڕیارەی داومە. دواهەمین نیگای ئەو نەشمیلە باڵا ورد و زیتەم لەبیرە. بەزەردەخەنە شەیتانئاساکانی پێی دەگوتم "ئاوات لێ دەکەم، بەمن دەڵێی بڕۆ ئاو و ئاو چی. دەبخۆ دەی".

کاتێ بەجێم هێشت، دوو خولەکی پێ نەچوو، من پەشیمان بوومەوە لە بڕیارەکەم. بۆیە پێی دەڵێم "من هیچ سڵ ناکەم لەوەی پەشیمان بوومەتەوە. نەك هەر ئەوە، بگرە هیچ سڵ ناکەم لەوەی لە پێش چاوی خەڵك دابنەوێمە سەر چۆك و پێڵاوت لەپێ هەڵکێشم. من وەك کوڕانی تر گورگ نیم تا ببم بەسەر یەشە و لە یەخەت نەبمەوە. من پیاوانە و ڕاشکاوانە و ڕووبەڕوو پێت دەڵێم: حەزم لێتە."

## ٦

چاوم نیشتەوە لەسەر تەنیا ڕووێکی مانگئاسا، لە کاتێکدا چەندان مانگی تر ئەو ناوەیان پڕ کردبوو. بەڵام خۆر تەنیا بۆ ئەو مانگەی چاوەکانمی داگیر کرد کڕنووش دەبات، ئەوانی تر مانگی بێ خۆرن. سڵم لە دەوروبەرم نەکردەوە و پێم گوت: با تەنیا دوو خولەك لە ژیانت بۆ من بێ، دوای ئەو دوو خولەکە هەموو ژیانت پێشکێشی من دەکەیت. چاوەکانی لێکناو بەفیزێکەوە گوتی "نا بابە، ئەوە چییە دیسان". منیش گوتم وەرە با گرەو بکەین، چاك دەزانم دوای ئەو دوو خولەکە خۆت تەواوی ژیانت دەدەی بەمن.

بەم گەمەیە پێکەنی. نەیدەزانی من لەو دوو خولەکەدا چی دەکەم، یان ئەوەتا زۆر لە من باشتر دەیزانی چیی لێ دەکەم. چاوم لە چاوەکانی دانەگرت. هەموو جار دەڵێم "بۆ ئاوا تەماشام دەکەی؟" ئەویش بەناز و لەسەرخۆ دەڵێ "کا تەماشام کردی!"

چێژم لە تەماشاکردنی وەرگرت و گوتم "ئەوە هەفتەیەك، بیر لەو گرەوە بکەوە، ئەوجا وەڵامم بدەوە". هێشتا قسەم تەواو نەکرد کاتێ گوتی "من ئەو گرەوە ناکەم". پێم گوت "باوەڕت هەبێ، پێش ئەوەی دوو خولەکە تەواو بێت، خۆت پێشکێشی من دەکەیت". هیچی نەکرد تەنیا پێکەنی.

لە تەواوی هەفتەکەدا، هەموو رۆژ خەونم بەو دوو خولەکەوە دەبینی. خەونی جۆراوجۆر و رەنگاورەنگ. لە خەونەکان خۆشتر، ئەو خەیاڵە بوو کە مانگەکە دەستی گرتم و رفاندمی بۆ پەنایەك و بەنەرمی گوتی "دەی، ئێستە دوو خولەك هی تۆم، بزانم چ دەکەی!؟"

بەو قسەیە دڵم لەرزی و بەم شێوەیە دوو خولەکەکەم سەرف کرد:

١٠ چرکە بەس تەماشام کرد. لەو ماوەیەدا بەچاو دەیگوت تۆ جیاوازی، بۆیە دوو خولەکم پێشکێش کردی.

١٠ چرکە بەس بۆنم کرد. بۆن چ بۆن، خۆشترین بۆن لە ناو هەموو بۆنەکانی دنیادا.

١٠ چرکە بەس لە باوەشم کرد. چاوەکانی لێکنا و هەستی بە ئارامی کرد. خۆشحاڵبووم کە ئەوە یەکەم جارە باوەشی پیاو دەبینێ.

١٠ چرکە نێوچەوان، روومەت، گوێچکەکان، چاوەکان، برۆ، لووت، تەواوی سیمام ماچ باران کرد.

٣٠ چرکە بەس لێوم مژی. کەمێك شڵەژا. دەستم لەناو قەدی گیرکرد و توند بەخۆمەوە نووساند، هەستم کرد هاتووەتە ناوم و منیش لەناو ئەودام. لەو بیست چرکەیەدا فێرم کرد، کە ئەو دەبێ لێوی سەرەوەی من بمژێت و منیش لێوی خوارەوەی ئەو، جارجاریش زمانی یەکتر بمژین.

٢٠ چرکە بە گەردن و سینگ و پشت مل و مەمکی داهەڵزنام و لێستمەوە و بەهێمنی دەمخوارد. هەموو گیانی گەرم داهات و تووند منی لەباوەش گرت، بەجۆرێك دەستەکانی لە ئێسکمدا چوونە خوارەوە.

ویستم ئەو ٤٠ چرکەی ماوە بچمە خوارەوە و بەزمان ئەو فستقە بلێسمەوە و بمژم کە دەمی بەئاستەم لێك کردبووەوە. بەڵام گوتی "من هەموو ژیانم بۆ تۆیە."

ئیتر بەم شێوەیە گرەوەکەم بردەوە...

کۆتاییی چیرۆکەکان.

★★★

دێریکی هاوڕێم چیرۆکەکانی بۆ پەریسا خوێندەوە و پێی گوتبوو کەوا خۆی ئەو چیرۆکانەی نووسیوە و حەزی لە چیرۆکە و کەیفی بە ئەدەب دێ. دواتر دێریك هاتە لام و داوای لێبوردنی کرد، کەوا چیرۆکەکانی بەهی خۆی داناوە. منیش لێیم نەگرت و لام ئاسایی بوو و دڵم دایەوە نیگەران نەبێ.

دوای چەند هەفتەیەك پەریسا و دێریك داوەتیان کردم بۆ ئاهەنگی ئاشتبوونەوەیان. لەوێ دێریك منی ناساند بەڤالدینی هاوڕێی. ڤالدین خەڵکی شیکاگۆ بوو و لە دایك و باوکێکی ئەمەریکایی بوو. دێریك لەوی گەیاند بوو، کەوا من یارمەیتم داوە لەگەڵ پەریسا ئاشت ببنەوە.

"دەزانی منیش یارمەتی یەکێکم دا بەم شێوەیە،" ڤالدینی هاتم لە بن گوێم چرپاندی.

"هەر بە چیرۆك؟" من پرسیم.

"نەخێر بەنامەیەك!"

"چ نامەیەك؟" من پرسیم.

## ١٩

# خۆشەویستیی ئەمەریکایی

وەڵامی پرۆفیسۆری نەدایەوە. خەیاڵی بڵقی دەدا. ئەو ڕۆژە هیچ ئاگای لە وانەکە نەبوو. پرۆفیسۆری وانەی زمانی عەرەبی پرسیارێکی ئاڕاستە کرد، بەڵام ئەو وەڵامی نەدایەوە وەك ئەوە وابوو کە هەر لە کلاسیش نەبێ. کە بەخۆ هاتەوە چووە سەر کورسییەکەی و یەك بە خۆی هاواری کرد.

"مـن دالیام خۆش دەوێ،" هاواری کرد، "ئەو موسلمانە و خەڵکی عێراقە."

منیش هێنامە خوارەوە و بردمە دەرەوە لە کلاس. چووین لە شوێنێك دانیشتین و ویستم دڵنەوایی بدەمەوە. ئەو کوڕە ناوی جەی بوو و ماوەی ساڵێك لە عێراق بوو لە ٢٠٠٥. لەوێ چاوی بە دالیا کەوتبوو و خۆشی ویستبوو. کەچی دالیا پێی ڕازی نەبووە. لە ٢٠٠٦ دالیا دێتە ئەمەریکا لەبەرئەوەی لەگەڵ ئەمەریکاییەکان کاری کردووە و بەهۆی بەرنامەی کۆچبەرانەوە دێ. جەی بەمە دەزانێت و دووبارە دەچێتەوە لای. دووبارە پێی دەڵێتەوە، بەڵام دالیا هەر ڕەتی دەکاتەوە. ڕۆژێکی تر هاتەوە لام و باسی دالیای بۆ کردم.

"من زۆرم ئەو خۆش دەوێ، بەڵام ئەو هەر من ڕەت دەکاتەوە،" گوتی و دەستی بەگریان کرد.

"ئەو کەیفی بەچی دێ؟" من پرسیم.

"کچێکی زۆر واقیعیە و حەزی لە ژیانە،" ئەو گوتی.

"ئەوە زۆر ئاسانە، من دەتوانم یارمەتیت بدەم،" گوتم.

"چۆن؟"

"من نامەیەکی بۆ دەنووسم و نامەکەی بە ئیمەیلێك بۆ بنێرە،" گوتم.

"چۆن بەوە ڕازی دەبێ، هەرچی قسەی دنیا هەیە بۆم کردووە."

"خەمت نەبێ، ڕازی دەبێ،" گەشبین بووم.

# نامەکە

گرفت و کێشەکانی دنیا لەبەر نەبوونی خۆشەویستییە. خۆشەویستی رووی لە کەمی کردووە، بۆیە خێزانەکانیش زیاتر تێك دەچن. هەرچی کچی دنیایە خەو بەپیاوێکەوە دەبینێ خۆشی بوێت، پیاوێك بۆی بسووتێ و هەموو شتێك لە پێناو ئەودا بکا و قەبوولێ بکات. هەرچی کچی دنیا هەیە حەز دەکات مێردەکەی خۆشی بوێت. گەورەترین نیعمەتی خوا بۆ کچان ئەوەیە مێردێك بکات و مێردەکەی خۆشی بوێت. من ئەو پیاوەم! من تۆم بەهەموو شێوەیەك خۆش دەوێت.

من گوناهم نییە کە تۆم خۆش دەوێ، ئەوە تۆی گوناهت دەگاتێ هەستی پڕ لە خۆشەویستیم رەت دەکەیەوە. ئەگەر باوەڕت بەخوا هەیە، خوا هەڵی ناگرێ و لێت توورەیە. تکایە وەك کچە لووتبەرزەکان مەبە کە داهاتوویان هیچی لێ شین نابێ. تکایە وەك کچە لووتبەرزەکان مەکە، وەرە رێز بۆ هەستەکانی من دابنێ. من دەزانم تۆ شەوانە بیر لەوە دەکەیەوە ئاخۆ نیازی من چی بێ. من ڕاشکاوانە و پیاوانە و بوێرانە راستەوخۆ پێم گوتی خۆشتم دەوێ. من ئەو پیاوەم کە خێزانی خۆمم خۆش دەوێ پێش ئەوەی بڵێ بەڵێ، پێش ئەوەی وەڵامم بداتەوە. تۆ بۆ ئەو نیعمەتەی خوا رەت دەکەیەوە.

تکایە متمانەم پێ بکە. من رێز لەو هەستەی تۆ دەگرم کە ئێستا متمانەت بە من نییە. تکایە من وەك کوڕانی تری ناو پەیمانگە تەماشا مەکە. من پلانم هەیە بۆ خۆم و خێزانەکەم کە تۆی. من زۆر بەجدی تۆم خۆش دەوێ و دەمەوێ خێزان لەگەڵ تۆ دروست بکەم. تکایە متمانەم پێ بکە. دەتوانی تاقیم بکەیتەوە. بێگومانم لەگەڵ من سەردەکەوی و پەشیمان نابیتەوە.

من بەم شێوەیە ژن و مێردایەتیی خۆم و خۆت دەبینم:

خانووێکی خۆش، ناوماڵێکی خۆش، هەریەکە و کاری خۆمان. ژیانێکی سادە و ئارام و هونەری. هەموو ئەمانە لە ژێر چەترێك کۆ دەکەینەوە، ئەویش چەتری خۆشەویستییە. من دەتوانم لەگەڵ تۆدا خۆشترین ژیان بژیم و هەرچی خەونت هەیە

بیهێنمە دی. لەبەرچاومە پێکەوە گەشت دەکەین بۆ شارە جوانەکانی دنیا وەك ئیستەنبۆل، پاریس، لەندەن، ڤێنیس، بەرشلۆنە و تاد. وەرە با پێکەوە دنیا ببینین. من مێردێك دەبم بۆت ئەوپەڕی ڕێزت لێ دەگرم.

من ئەو جۆرە مێردەم بۆ تۆ:

ڕێز لە بڕیارەکانت دەگرم، ڕێز لە بۆچوون و رات دەگرم. ڕێز لە هەستی ئافرەتانەت دەگرم. ڕێز لە ئازادییەکانت دەگرم. ئەوپەڕی ڕێزم هەیە بۆ دایك و باوك و برات و خانەوادەکەت. من پیاوێکی دڵڕەق نیم، پیاوێکی دڵپیس و ڕەزیل نیم. هەرچی کچی دنیا هەیە نایەوێ پیاوەکەی دڵپیس و ڕەزیل بێ. ئەوە منم ئەو سیفەتە خراپانەم نییە. تکایە متمانەم پێ بکە. من ژیانی خۆم و خۆت زۆر بەسەرکەوتوویی دەبینم. وەرە با پێکەوە دروستی بکەین.

من ڕقم لە درۆیە، من ڕقم لە ڕابواردنە بەکچان. من پیاوێکی ڕاستگۆم لەگەڵ خوای خۆم، لەگەڵ خۆم و لەگەڵ خێزانەکەم کە تۆی لە داهاتوو. من حەزم لە دوو منداڵە: کوڕ و کچێك. ئەگەر تۆ حەزت لە زیاترە ئەوا ڕێز لە ڕای بەڕێزت دەگرم و دێمە سەر ڕاکەی تر. من پیاوێکی کەللە ڕەق و پیاوسالار نیم. من لەو پیاوانە نیم دۆ و دۆشاو تێکەڵ بکەم. من پیاوێکی ئارامم، پڕم لە خۆشەویستی بۆ تۆ. من جیاوازم و وەك کوڕانی تر بیر ناکەمەوە. من بەجدی بیر لە داهاتووی خۆم و خۆت دەکەمەوە. من منداڵانە نیم و بیر لە شتی پوڕ و پووچ ناکەمەوە. ئەگەر مەبەستم ڕابواردن و شتی خراپ بووایە، ئاوا پیاوانە نەدەهاتمە پێش و ڕاستەوخۆ پێم نەدەگوتی. تکا دەکەم متمانەم پێ بکە. متمانە بەخۆشەویستییەکەم بکە بۆ تۆ.

من دەتوانم دڵ خۆشت بکەم. بەڵێنی ژیانێکی خۆش و پڕ لە ئارامی و خۆشەویستیت پێ دەدەم. من زۆرم بیرم لە تۆ و لە داهاتووی خۆمان کردووەتەوە. من مێردێك نیم وەك کۆیلە یان خزمەتکار تەماشای خێزانەکەم بکەم. من لەو پیاوانە نیم حساب بۆ ژنەکەی خۆم نەکەم. ئێمە دەتوانین خزمەتی یەکتری بکەین. بەوەوە جوانین خزمەتی یەکتری بکەین. من ئامادەم ئەگەر تۆ نەخۆش بیت من ئاوت بۆ بێنم، پاکت بکەمەوە، چێشتت بۆ لێ بنێم و بەملاك بەدەمتەوە بکەم. من ئامادەم لە کاروباری ناو

ماڵدا یارمەتیت بدەم. ئێمە هەردووکمان دەبین بەخاوەن کار و لە ماڵەوەش یارمەتی یەکتری دەدەین. کاکە نانی بەیانیان عایدی من، نیوەڕۆیان پێکەوە ئامادەی دەکەین و ئێوارانیش هەر خۆم. ئەگەر حەزیشت کرد بەپێچەوانەوە بێت، ئەوا من قەبووڵمە.

وەرە با پێکەوە خێزانێك دروست بکەین لەسەر بنچینەی خۆشەویستی. با خێزانێك دروست بکەین لەسەر بنچینەی لێك تێگەیشتن و یەکتری قەبووڵکردن و لێبوردەیی. ژن و مێردایەتی چاك ئەوەیە کە ژن و مێرد یەکتریان خۆش بوێ، لە یەکتری تێبگەن و لە یەکتری ببورن. من ئەو سیفەتانەم تێدا هەیە. من تا سەر ئێسقان تۆم خۆش دەوێ، تا سەر ئێسقان روحی لێبوردنم هەیە و تکایە قەبووڵم بکە با لێت تێبگەم و یەکتری تەواو بکەین.

ئەو قسانەی بۆ تۆم نووسیوە لەم نامەیە هەمووی قسەی واقیعین. من وەك کوڕانی تر بە شیعری بێ مانا و قسەی بۆش و بەتاڵ و پڕو و پووچ کات ناکوژم. من مەسەلەکەم بەجدی وەرگرتووە و تەمای ژن هێنانم هەیە. من دەتوانم لەسەرت بوەستم. من داوای عیلاقەت لێ ناکەم. من داوای ئەوەت لێ دەکەم شووم پێ بکەی. داوای عیلاقە و داوای شووپێکردن دوو شتی زۆر جیاوازن. داوای عیلاقە واتە ڕابواردن، بەڵام داوای شووپێکردن ئەوپەڕی ڕاستگۆیی و پیاوەتییە. من دەمەوێ خۆشەویستیی قووڵی ئێمە دوای زەواجمان دەست پێ بکا. وەکو پێغەمبەریشمان دەفەرمووێ کەوا چاکترین خۆشەویستیی لە بەینی ژن و مێردا دوای زەواجە.

من ڕادەوەستم تا خوێندن تەواو دەکەی. ڕادەوەستم تا ئەو کاتەی بەڕێزت پێم دەڵێی وەرە پێش. ئەگەر کوڕێك بام تەمای ڕابواردنم هەبووایە، قەت بەو شێوەیە قسەم نەدەکرد و ناوی زەواجم نەدەهێنا. داهاتووی من بەبڕیاری بەڕێزتەوە بەندە. تکایە بیر بکەوە. من خۆم لەگەڵ تۆدا دەبینمەوە. من لەگەڵ تۆ ئاسوودە دەبم و دەتوانم بەهەموو شێوەکیش تۆ ئاسوودە بکەم. من ڕێز بۆ هونەرەکەت دادەنێم. لەبەرامبەرت دادەنیشم تا وێنەکەت تەواو دەکەی. لەبەرچاومە دوای زەواجمان تۆ سکێچی من دەکەی و جاروبار لێم تووڕە دەبی و پێم دەڵێی ئەوەندە مەجووڵێ. لەبەرچاومە تۆ خەریکی ڕەسم دەبیت و منیش ئاوت بۆ دێنم.

ئەوە هەستی منە بەرامبەر بەتۆ. ئەوە خۆشەویستی منە بەرامبەر بەتۆ. تکایە ئەوانەی من باسم کردووە لەم نامەیە تەنیا خۆشەویستی و ڕێزگرتنە بۆ بەڕێزت. ئەو قسانە بەبێهێزی من تێ مەگە. من پیاوێکی زۆر بەهێزم. دەتوانم بەرگەی هەموو ناخۆشییەك بگرم. ژیان پیاوی خۆگر و ڕاگر و بەهێزی دەوێ. تۆ حەز ناکەی مێردێکی بەهێزت هەبێ، حەز ناکەی مێردێکت هەبێ تا سەر ئێسقان تۆی خۆش بوێ، حەز ناکەی مێردێکت هەبێ گوێت لێ ڕابگرێ، ڕێزت بگرێ و لێـت تێبگا، من ئەو پیاوەم کە تۆ دەتەوێ و بەدوایدا دەگەڕێی. تکایە ڕێز بۆ هەستەکانم دابنێ و بیر بکەوە. تکا دەکەم متمانەم پێ بکە.

★★★

ئەمە نامەکەی ڤالدین بوو بۆ جەی کە بۆ خۆشەویستە دلڕەقەکەی خوێندبووەوە. نامەکەی سەری گرت و دلبەرد بوو بەدلنەرم و ڕازی بوو و مێرد بە جەی بکات. سەرسام بووم بە نامەکە چونکە بە دلی کچانی عێراقی نووسرا بوو کە وەها ئاسان متمانە بە پیاو ناکەن. نامەکە ڕەنگدانەوەی قوولی کولتووری عێراقی بوو، وەك بلێی لەلایەن نووسەرێکی عێراقییەوە نووسرا بێ بۆ دلبەرە دلڕەقەکەی.

"چۆن توانیت بیری کچانی عێراق بخوێنیتەوە و ئەو نامەیە بنووسی؟" من پرسیم لە کۆتاییی ئاهەنگەکە.

"بلێم چی . . . ئەزموونم لە عێراق وای لێکردم لەو شتانە سەر دەربکەم . . ." وەلامی دایەوە.

"چۆن . . . پێشتر لە عێراق بوویت دیارە؟"

"بەلێ . . . لە ٢٠٠٣ تا ٢٠٠٥ لە عێراق لەگەل سوپای ئەمەریکادا بووم. لەوێ چوومە قوولایی کولتووری عێراقی.

ئافرەتانی عێراق تا سەر ئێسقان بەدەستی پیاوسالارییەوە دەنالێنن. بۆیە وەها ئاسان متمانە بە پیاو ناکەن و هەردەم زۆر دوودلن لە هەلبژاردنی پیاوێك ببێ بە مێردیان."

"راستە!" من بە سەرسامییەوە گوتم.

دوای تەواوبوونی ئاهەنگەکە، لەگەڵ ڤالڵدین ژمارەی پێوەندیمان گۆڕییەوە بۆ ئەوەی لە داهاتوو پێوەندیمان بەردەوام بێ. سوپاسی دێریك و پەریسام کرد بۆ داوەتەکەیان و هیوای ژیانێکی سەرکەوتووم بۆ خواستن. هێواش بەرەو ماڵ وەڕێ کەوتم و تا ماڵ بیرم لە نامەکە دەکردەوە.

"بەڕاستی نامەیەکی واقیعی و قایلکەر بوو،" من بەخۆمم گوت و هەستم بەدڵخۆشی کرد. "ڕاستییان گوتووە کەوا خۆشەویستی دەتوانێ هەموو شت دروست بکات، بەڵام هیچ شتێ ناتوانێ خۆشەویستی دروست بکات."

★★★

چوومە تەنیشتی دانیشتم و دەستمان بە قسان کرد. هەردووکمان دڵمان پڕی قسە بوو. یەکترمان نەدیبا، ڕەنگ بوو بتەقیباینەوە. وەك بڵێی دەمێك بێ چاوەڕێی یەکترمان دەکرد قسە بۆ یەکتری بکەین. مانگێك دوای ئاهەنگەکەی پەریسا و دێریك و ناسینی ڤالڵدین، ئەو کچەم ناسی. ماوەی دوو سەعات پێکەوە قسەمان کرد. زۆر شت لەیەکترییەوە فێر بووین. من دەسپێشخەریم کرد بۆ یەکتر ناسین، بەڵام شێوازەکە زۆر جیاواز بوو. یەکترناسینەکەمان زۆر جیاواز بوو لە یەکترناسینی ئاسایی ڕۆژانە لە نێوان کچ و کوڕێکدا.

"تووڕە نابی، ئەگەر پێت بڵێم تۆ زۆر جوانی،" من چوومە تەنیشتی و وام پێ گوت.

سەری هەڵبڕی و پێکەنی و ئەوجا گوتی، ". . . سوپاست دەکەم."

"من گۆرانم."

"من لیتام."

"بۆ کوێ دەفڕی؟" پرسیم.

"بۆ کوێ باشە بەڕای تۆ؟" ئەو پرسییەوە.

"بۆ بەهەشت!"

# ٢٠

# ئەمەریکا و میسر

ماوەی دوو سەعات لە بەر باران گریام، گریانێك بەکوڵ. بۆ کوڕەکەم، بۆ خێزانم بۆ دایك و باوکم دەگریام. گریان و باران تێکەڵ بەیەکتر بووبوون. کە هاتمە دەرەوە چەترم لەگەڵ خۆم نەهێنا، بۆ ئەوەی لەبەر باران بگریم و کەس هەستم پێ نەکات. هەموو لەشم خوسای ئاو بووبوو. غەریبی خەریك بوو سەری دەخواردم. ئەگەر نەهاتبامە دەرەوە و نەگریابام، ڕەنگ بوو بتوابامەوە و بووبام بەئاو وەك چۆن سەهۆڵ لەبەر تیشکی گەرمی خۆر دەتوێتەوە.

ئەو دوو سەعاتە لەبەر باران بڕیارێکم دا، ئەویش بڕیاری گەڕانەوەم بوو بەسەردان لە پشووی زستاندا. پێشتر پلانم دانابوو کە سەردانی کەنەدا بکەم لەو ماوەیەدا. خاڵی خێزانەکەم لە کەنەدا داوەتنامەی بۆ ناردم و ڤیزەشم بۆ کەنەدا وەرگرتبوو. ئەو ڕۆژەی ئەو بڕیارەمدا تەنێ هەفتەیەکی مابوو بۆ پشووی زستان و بچم بۆ کەنەدا. بەڵام غەریبی تەنگی پێ هەڵچنیم و لەپڕێکا هەموو شتێکم گۆڕی. هەر ئەو ڕۆژە دوای گریانەکەم، گەڕامەوە و پلیتی فڕگەم بۆ کوردستان بڕی. هەفتەیەك دواتر فڕیم بۆ کوردستان.

بینینی کوڕەکەم و خێزانەکەم دوای پێنج مانگ و نیو، هەموو شتێکی لە بیر بردمەوە. وەك بڵێی تووشی نەخۆشی لەبیرچوونەوە بووبم، هیچ شتێکی پێشووم لە بیر نەما. ئەوە من نەبووم ئەو هەموو فرمێسکەم هەڵڕشت بوو بۆ غەریبی ئەوان. هاتنەوەم و بینینی ئەوان پێنج مانگ و نیو بەر لەو دەمە خەیاڵ بوو، وا بوو بەواقیع.

دوای گەڕانەوەم ئەو واقیعە بوو بە یادەوەری. ئیتر ژیان بریتییە لە خەیاڵ و واقیع و یادەوەری. ئەوەی خەونی پێوە دەبینی، دەبێ بەڕاستی و دواتریش بە یادگاری.

دوای ٢٥ ڕۆژ مانەوەم لە کوردستان، تێر بووم لە بینینی کوڕەکەم و خێزانەکەم. تێر یاریم لەگەڵ کوڕەکەم کرد. تێر قسەم لەگەڵ خێزانەکەم کرد و تێر لە باوەشی یەکتر بووین. تێر دایك و باوك و خوشك و براکانم بینی. ئەو ڕۆژەی گەڕامەوە هەموو ئەمانە بوون بە یادەوەری. گەشتەکەم ترانزیتی ئیستەنبول و لەندەنی تێدا بوو. شەوێك لە ئەستەنبول مامەوە و ڕۆژی دواتر فڕیم بۆ لەندەن.

گەشتی دواترم بۆ شیکاگۆ بوو، بەڵام کە گەیشتم گەشتەکەم ماوەی دوو سەعات دوا خرا. بۆیە ماوەی چوار سەعاتم هەر لە فڕگەی هیترۆ، لەندەن بەسەر برد. فڕگەکە جمەی لێوە دەهات. هەرچی دنیا هەیە لەوێ کۆ دەبێتەوە. چووم بەدوای شوێنێکدا بگەڕێم، دانیشم و چاوێك بەرۆژنامادا بخشێنم. بەحاڵ شوێنێکم دەسکەوت. ڕۆژنامەیەکم بەدەستەوە گرت و خوێندمەوە. دوای تەواوبوونی یەکێك لە هەواڵەکان، سەرم هەڵبڕی و چاوم بەجوانکیلەیەك کەوت کە وێنەی نەبوو لە دنیا. جوانییەکەی یەکسەر سەرنجی ڕاکێشام و سەرسام بووم پێی. بۆیە چاوم نەچووەوە سەر ڕۆژنامەکان و بەردەوام بوو لە تەماشاکردنی مانگ. وامزانی مانگ هاتووەتە خوارەوە.

یەکێك لە تەنیشت مانگ هەڵساو ڕۆیشت. من یەکسەر چوومە تەنیشتی. چاوم لا نەدا و هەر تەماشایم دەکرد. دواتر بۆ ئەوەی کارەکە بێتام نەکەم، دەنگم هەڵبڕی.

"تووڕە نابێ، ئەگەر پێت بڵێم تۆ زۆر جوانی،" من چوومە تەنیشتی و وام پێ گوت.

سەری هەڵبڕی و پێکەنی و ئەوجا گوتی، " سوپاست دەکەم."

"من گۆرانم."

"من لیتام."

"بۆ کوێ دەفڕی؟" من پرسیم.

"بۆ کوێ باشە بەڕای تۆ؟" ئەو پرسییەوە.

"بۆ بەهەشت!"

دەستی کرد بەپێکەنین. وەك بڵێی ئەکتەری ناو فیلمێکە و ئاکتی دەکرد. تەماشای دەکردم و دواتر بەزەردەخەنەوە سەری دادەنواند. دڵمان پڕ بوو لە قسە.

"من دەفڕم بۆ میسر،" لیتا وای گوت. "ئەی تۆ؟"

"شیکاگۆ، دواتر بۆ کانزەس سیتی و لەوێشەوە بۆ لۆرێنس."

"گەشتێکی درێژە،" بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی. "خەڵکی کوێی؟"

"کوردستان."

"هێندەی نەماوە ببن بەدەوڵەت ئێوە،" وای گوت. "زۆرتان ئازار چەشتووە بەدەستی دیکتاتۆری پێشوو. ئەگەر خۆتان رێك بخەن و گرینگی بە تەکنەلۆژیا و پێشکەوتن بدەن ئەوا پاشی پێنج ساڵی تر دەتوانن ببن بەدەوڵەت و دنیاش پشتگیریتان دەکات."

من سەرم سوڕما. چۆن ئەو هەموو زانیارییە لەسەر کورد دەزانێ. بۆیە خۆم پێ نەگیرا و پرسیم، "تۆ خەڵکی کوێی، چیت خوێندووە و چۆن ئەمانە لەسەر کورد دەزانی؟"

"خەڵکی ئەمەریکام، دیراسەی رۆهەڵاتی ناوەڕاستم خوێندووە، بۆیە زۆر شت لەسەر گەلی کورد دەزانم." ئەوەی گوت و هەڵسا یەك دوو هەنگاو بەرەو بۆردی گەشتەکان چوو و تەماشای کرد بزانێ دەروازەی گەشتەکەی نووسراوە. دواتر گەڕایەوە شوێنی خۆی.

"لە میسر کار دەکەی، یان بۆ گەشتەوەری دەچی؟" پرسیم.

سەری هەڵبڕی و تەماشای کردم. دەموچاوی پڕ بوو لە رژدی و نیگەرانی و ناخۆشی و نهێنی. سەری دادایەوە و هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی. ئەمجارە تەماشای کردم، بەڵام چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو.

"من لەوێ دەژیم، لەوێ گیرساومەتەوە،" بە دەنگێکی پڕ لە گریانەوە وای گوت.

"بۆ کار . . . یانیش . . . ماڵتان لەوێیە لەگەڵ دایك و باوکت؟" پرسیم.

خۆی پێ نەگیرا، دای لە قولپی گریان. هێند گریا تا دڵی پاك بوویەوە. وەك بڵێی دەمێك بوو پێویستی بە یەکێك بووبێ قسەی بۆ بکا و بگری.

"من مێردم بە میسرییەك کردووە،" بە گریانەوە وای گوت. "گەورەترین هەڵە لە ژیانم ئەوە بوو کردم."

"دەکرێ بپرسم، چی رووی دا."

"ناتوانم باسی بکەم،" بەهەنسکەوە وای گوت. "بەڵام وا دەچمەوە تەڵاق وەردەگرم و دەگەڕێمەوە ئەمەریکا."

"ئەی بەتەنیا دەڕۆی، کەسی ترت لەگەڵ نییە." پرسیم.

"نەخێر هەر خۆمم."

"بەڵام ئەوە کارێکی باش نییە بەتەنیا بچی بۆ ئەوێ و داوای تەڵاق بکەی."

سەری ئەرێنی بادا و دەستی بەگریان کردەوە. دواتر پێی گوتم کەوا نەیویستووە دایك و باوکی ئەزیەت بدا. بۆیە هەر خۆی بڕیاری داوە ئەمە بکە. لە قسەکانیدا دەرکەوت کەوا مێردەکەی چەند جارێکی لێ داوە. لیتا خەڵکی واشنتن دی سی بوو و لەوێ مێردەکەی بەناوی تامر ناسیوە. یەکەم جار زۆر خۆی مۆدێرن و کراوە و باش پێشانداوە. بەڵام پیاوێکی تەواو جیاواز دەرچووە دوای هاوسەریەتی.

"نامەوێ زیاتر باسی ئەوە بکەین، بەڵام ژیانی میسر چۆنە؟" پرسیم.

"میسر وڵاتێکی زۆر خۆشە، بەڵام دەسەڵاتێکی زۆر دیکتاتۆر و بێ مانای هەیە،" لیتا گوتی. "میسر دەبووایە وەك ئەمەریکا لە پێشەنگی وڵاتان بێ، بەڵام حوکمەکەی ڕێی پێ نادا."

"ئەی مێردەکەت چ کارەیە؟" پرسیم.

"مێردەکەم لەگەڵ حکوومەت کار دەکا،" دەستی کرد بەگریان. دواتر بەردەوام بوو، "خیانەتی لە خەڵك دەکرد و تەندەری دەدا بەکۆمپانیاکان بەپارە. منیش ڕێگریم لێ دەکرد و چەند جارێك لەسەر ئەوە تێی هەڵداوم."

"چۆن؟!"

فرمێسکەکانی سڕییەوە. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. جارێکی تر تەماشای بۆردەکەی کردەوە. هەروەکو خۆی گوتەنی مێردەکەی پیاوی پارە بوو نەك ماڵ و حاڵ. دواتر گوتی "هەموو شتێکم قبووڵ کرد تەنێ بۆ ئەوەی بتوانین پێکەوە بژین. بەڵام سەری نەگرت و ئیتر منیش بێزار بووم."

دواتر خۆی بوارد و چوو بۆ ئاودەست. هاتەوە تەواو هەموو شتێکی لە بیر خۆی بردبووەوە. دەموچاوێکی گەشی هەبوو. پێکەنی و قوومێکی لە شەربەتەکەی دا. منیش نەمویست زیاتر هەستی بریندار بکەم و باسی کێشەکەی بکەم زیاتر، هەرچەندە ویستم زیاتر بزانم. بەڵام ئەو دواتر بابەتەکەی گۆڕی.

❊❊❊

"گەشتەکەت چۆن بوو؟"

"گەشتێك پڕ بوو لە سووکایەتی!"

"بۆ؟"

# ٢١

## سووکایەتی، ترس و رق

چوونەوەم ئاسایی بوو، چونکە کەس لای گرینگ نییە دەچمەوە عێراق. بەڵام هاتنەوەم پڕ بوو لە سکووکایەتی، چونکە هەموو کەس لای سەیر بوو منێکی عێراقی دەچمە ئەمەریکا. تەنانەت لە ناو فڕگەی هەولێریش کە زێدی خۆمە دەیان جار پاسپۆرتیان هەرگێڕ و وەرگێڕ کرد، چونکە گومانیان هەبوو لەوەی چۆن بە شێوەیەك من فیزەی ئەمەریکام هەیە. کە لە ئیستانبول نیشتمەوە دواتر ویستم لەوێوە بفڕم بۆ لەندەن و دواتریش بۆ شیکاگۆ. لەوێ ماوەی سەعات و نیوێك منیان ڕاگرت تا پاسەپۆرت و فیزەکەمیان پشکنی، چونکە گومانیان هەبوو چۆن منێکی عێراقی دەچمە ئەمەریکا. نابێ . . . چۆن عێراقی گەشت دەکەن و چۆن فیزا وەردەگرن. لە لەندەن بۆ شیکاگۆ هەمان سیناریۆ دووبارە بوویەوە.

لە هەرچی دنیا هەیە گەڕاوم، پاریس، ئەمستردام، ڤێنیس، ستۆکهۆلم، بەرلین و زۆربەی ویلایەتەکانی ئەمەریکا و زۆربەی شارەکانی تری ئەوروپا. لە هەموو ئەو شوێنانە مرۆیێکی ئاسایی بوومە، بەڵام هەرکە پاسپۆرتەکەم پێشان داوە بەهەر هۆیەك بووبێت، یەکسەر لە ئاستی کەسایەتی و مرۆییتدا کەم دەبێتەوە. کە دەبینن پاسپۆرتەکەت عێراقییە، یەکسەر گومان لایان دروست دەبێ و تۆیان لێ دەبێ بەدێوەزمە. بەدەیان پرسیاریان لا دروست دەبێ، چۆن دەبێ عێراقییەك هەر بۆ گەشت بێــتە ئەوروپا.

" لیتا، ئەمانە هەمووی سوکایەتین و کەمکردنەوەیە لە ئاستی مرۆییی من،" بە لیتام گوت.

"هۆکارەکە ئەوەیە عێراق هەردەم لە جەنگدا بووە و هاوڵاتییانی بەردەوام ویستوویانە ڕێگەی نایاسایی بگرنە بەر بۆ هەڵاتن لە وڵات و پەنا بەرنە بەر وڵاتانی

ڕۆژئاوا بۆ ژیان،" لیتا وای گوت و دووباره تەماشایەکی بۆردەکەی کردەوە. ئەمجارە خێرا خۆی خڕ کردەوە و تۆقەیەکی لەگەڵ من کرد و خۆشحاڵ بوو بەناسینم و لێیدا ڕۆیشت، چونکە ژمارەی دەروازەکەی دەرچوو لەسەر بۆردەکە.

★★★

منیش ماندوو بووم. لە شوێنی لیتا و خۆم پاڵم دایەوە. نێزیکەی سەرخەوێکم شکاند. لە ناکاو یەکێك رای هەژاندم و منی لە خەو کرد. کە چاوم کردەوە کچێکی سەر بەچەفیە بوو. تەمای دانیشتنی هەبوو، چونکە شوێنەکە زۆر قەرباڵغ بوو و ئەویش لە شوێنێکدا دەگەڕا و منیش دوو شوێنم داگیر کرد.

"دەتوانم لێرە دانیشم؟" پرسیاری کرد.

"بەڵێ . . . فەرموو" بەدەم خەو هەستامەوە و شوێنەکەم بۆ چۆل کرد. دوای چەند چرکەیەك، سەریەشەیەکی خراپ دایگرتم. سەریەشەکە هی ئەوە بووو کە سەرخەوەکەم باش نەشکاند بوو. هەرچۆنێك بوو، هەڵسامەوە تۆزێك خۆم لێك کشاندەوە و تەماشایەکی دەوروبەرم کرد. دواتر تەماشای سەعاتم کرد بزانم کەی ژمارەی دەروازەی من دێ. هێشتا دوو سەعاتی مابوو. کچەکەی تەنیشتم پێدەچوو تەمەنی ٢٤ساڵ بێ. لە ناو لچکەکەیدا زۆر جوان دەهاتە بەرچاو. تەماشام کرد خەریکی هیچ نییە و ناوناوە تەماشای ساتەکەی دەکات. زانیم کاتی لێ ناڕوا.

"خەڵکی تونسی؟، قوڕگم پاك کردەوە و تۆزێك لێی چوومە پێش.

"نەخێر،" کەمێك پێکەنی و بەخۆشی و بەردەوام بوو، "من خەڵکی لبنانم."

"ئەها . . . لە بەیروت دەژی؟"

"بەڵێ،" چاوەکانی لێك ناو دواتر تەماشای کردم و دیار بوو حەزی لە قسانە.

"بۆ کوێ دەفڕی؟"

"دەچم بۆ مایامی،" تەماشایەکی سەعاتەکەی کردەوە و بەردەوام بوو، "سەردانی براکەم دەکەم لەوێ."

پاشان هەڵسا و شوێنەکەی بەجێ هێشت، دوای چوار پێنج هەنگاو، گەڕایەوە و گوتی، "شوێنەکەم بگرە ئێستە دێمەوە."

منیش وامزانی چوو بۆ ئاو دەست و جانتاکەم لە شوێنی ئەو دانا بۆ ئەوەی کەس لەوێ دانەنیشێ. کچێکی رۆشنبیر و لەسەرخۆ و ژیر دیار بوو. لەو بیرانەدا بووم، بینیم گەڕایەوە بەخۆی و بەدوو کۆکە کۆلە و دوو کێکی خۆش.

"ئەوەم بۆ تۆ هێناوە،" کۆلایەك و کێکێکی دا پێم. منیش بەسوپاسەوە لێم وەرگرت و ئیتر پێکەوە دانیشتین. خواردمان. من تەماشایەکی دەوروبەری خۆم کرد، هەر هەمووی سەرقاڵ و چاوەڕێ بوو. هەندێ خەویان دەهات، هەندێ بێزار، هەندێ تووڕە، هەندێ قسەیان دەکرد و هەندێکیش بەزەردەخەنەوە هەندێکیش پێدەکەنین و هەندێکیش سەرقاڵی لاپتۆپەکەیان بوون.

"تۆ دەچی بۆ ئەمەریکا؟" قوومێکی لە کۆلایەکەی دا.

"بەڵێ،" بەردەوام بووم، " لەوێ دەخوێنم لە بواری رۆژنامەوانی لە زانکۆی کانزەس."

"پرسیارێکت لێ بکەم . . ." تەماشایەکی کردم و بەنیگەرانییەوە پرسی.

"بۆ نا . . . فەرموو هەر پرسیارێکی دەیکەی ئاساییە،"

"بۆچی وڵاتانی ئیسلامی بەردەوام لە پاشەکشێ دان و وڵاتانی رۆژئاواش هەردەم پێش دەکەون؟"

کە گوێم لەو پرسیارە بوو، سەرم سوڕما. چۆن ئەو کچە بیر لە شتێکی ئاوا دەکاتەوە. پرسیارەکە لە شوێنی خۆیەتی و زۆریش تەواوە. ئاخۆ هیچ وڵاتێکی ئیسلامی بیری لە شتێکی ئاوا کردووەتەوە. ئاخۆ هیچ وڵات و سەرکردەیەکی موسلمان بیری لە شتێکی ئاوا کردووەتەوە. تۆزێك کەوتمە گومان لەو کچە.

"ببورە ناوت چی بوو،" پرسیم.

"مەریم."

"چیت خوێندووە بەم شێوەیە بیر لەو پرسە قووڵە دەکەیەوە،" من ئەو پرسیارانەم کرد بۆ ئەوەی دڵنیام کە سەلامەتە گفتوگی لەگەڵ دەکەم، چونکە من بڕوام

بەوە هەیە کە ئەگەر بتەوێ بمێنییەوە دەبێ باوەڕ بەکەس نەکەی. بۆیە ویستم دڵنیا بم سەر بەهیچ لایەنێکی سیخوڕی نییە.

"تۆ رات چییە، لەسەر ئەم پرسیارە،" پرسیارەکەم لەخۆی پرسییەوە، "دیارە دەمێکە بیرت لێ کردووەتەوە."

"بیرم لە شارستانی ئەندەلوس کردووەتەوە، بیرم لە شتە جوانەکانی ئیسلام کردووەتەوە. بەڵام نازانم بۆچی وڵاتانی ئیسلامی هەر بەپاش دەکەون. خۆی دەبوایە هەر ئێمە پێش بکەوین. بەڕای من ئەوروپا و ڕۆژئاوا زۆر شت لە شارستانییەتی ئیسلامی فێربوونە و وەرگرتووە. تا شارستانی ئیسلامی هەبوو، هیچ شوێنێکی تر بەو شێوەیە نەبووە. بۆ ئەمە پێچەوانە بووەوە."

تەماشایەکی بۆردەکەم کرد و کەمێك بیرم لە قسەکانی کردەوە. پێدەچوو دەمێکە بیر لەو پرسیارەی دەکاتەوە. تەواو دڵنیا بووم کە حەزی لێیە کات بکوژێ بۆیە بابەتێکی قووڵی هێناوەتە گۆڕێ.

"دەتەوێ رای من لەسەر ئەو بابەتە بزانی . . . جارێ پێم بڵێ خۆ تۆ رۆژنامەنووس نیت؟"

"نەخێر،" هەردووکمان پێکەنین.

"گەلانی ئیسلامی سەقەت بیر لە ژیان دەکەنەوە. بەردەوام بیر لە رابردوو دەکەنەوە و لە ترسدا دەژین. بەڵام گەلانی رۆژئاوایی بەتایبەتی ئەمەریکا بیر لەمڕۆ و بەیانی دەکاتەوە. ئەمڕۆ چی دەکا و بەیانی چی پێ دەکرێ."

چاوەکانی زەق کردەوە و حەپەسا بەو وەڵامەی من. کەمێك لێم هاتە پێش و قاچەکانی خستە سەریەك و گوتی، "مەبەستت لە بیرکردنەوەی سەقەت چییە؟"

"موسلمان بەم شێوەیە بیر دەکاتەوە: ئەوەندەی هەمە بەسە، ئیتر بۆچی زیاتر کار بکەم، رۆژێك دێ هەر دەمرم. ئیتر ئەوەندە بەسە. بۆیە کار ناکات و پێش ناکەوێت. هەر خەریکی خواردن و نووستنە."

"ئەی رۆژئاوایی . . . دەڵێن ئەمەریکاییەکان زۆر دەخۆن و زۆر قەڵەون و دەنوون و دەخۆن،" قوومێکی لە کۆلاکەی دا.

"راسته . . . ئەوان زۆر دەخۆن بەڵام کار دەکەن. بیر لەوە دەکەنەوە چی بەدەست دێنن و چەند زیاد دەکەن. بەردەوام کار دەکەن بۆ ئەوەی بگەن بەمەرامیان. ئەگەر بۆ هیچ کار نەکات بۆ ئەوە کار دەکا تا بێ کار دانەنیشێت. بەڵام گەلانی ئیسلامی ئەگەر شتێکی هەبێ ئەمڕۆ بیخوا، دادەنیشێ دەیخوا و شوکرانەی خوا دەکا. قەناعەتی تەواوی بەوە هەیە کە هەیەتی و تمووحی زیاتری نییە."

"راستە . . . رۆژئاواییش تموحیان زۆرە."

هەردووکمان کەمێك لە کێکەکانمان خوارد و قومێکمان لە کۆلاکە دا. هەردووکمان بەیەکەوە سەیری بۆردەکەمان کرد و هێشتا کاتمان زۆری مابوو.

"من پرسیارێك لە تۆ دەکەم،" گوتم.

"فەرموو . . . زۆر حەزم لەو جۆرە گفتوگۆیانەیە،" بەهێمنی گوتی.

"بۆچی گەلانی رۆهەڵاتی ناوەڕاست رقیان لە ئەمەریکایە، ئەمەریکاییەکانیش لە گەلانی رۆژئاوایی دەترسن ؟" من پرسیارم کرد.

"گەلانی ئەمەریکایی دوای هێرشەکەی یانزەی سێپتێمبەر بۆچوونیان گۆڕا بەرامبەر بەموسلمانان. هەروەها گەلانی رۆهەڵاتی ناوەڕاستیش وا هەست دەکەن ئەمەریکا نەوتیان دەبا، دەست لە کاروبارییان وەردەدا، کێشە دروست دەکا، بۆیە رقیان لەیەکە."

هەردووکمان بۆ ماوەیەك بێ دەنگ بووین و دواتر ئەو پرسی، "ئەی تۆ چۆنی تێدەگەی؟"

"بەرای من پرسەکە لەسەر ئاستی سیاسەتە، بەڵام ئەمە رەنگی داوەتەوە سەر خەڵکەکەش."

"نەخێر ئەوانە نییە؟"

"ئەی چییە"

"نەوت و تیرۆریزم!"